بۆ مێردمنداڵان

ئەستريد ليندگرين

# هەر شادییە لە دێ بچکۆل



ئەسترید لیندگرین

# هەر شادییە لەدێ بچکۆل

گۆڕینی لە سویدییەوە
حەمە دۆستان



وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان
بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕاگەیاندن و چاپ و بڵاوکردنەوە
بەڕێوەبەرایەتیی ڕاگەیاندن و چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

**ئەم کتێبە لەسەر بودجەی پایتەختی ڕۆشنبیریی چاپ کراوە**

ناوی کتێب: هەر شادییە لە دێ بچکۆل
بابەت: چیرۆک
نوسینی: ئەسترید لیندگرین
گۆڕینی لە سویدییەوە: حەمە دۆستان
پیتچنین: حەمە دۆستان
پێداچوونەوە و هەڵەچنی: دلێر محەممەد
نەخشەسازی بەرگ و ناوەوە: هەڵاڵە عەزیز
سەرپەرشتیاری چاپ: کارزان عەبدوڵڵا
چاپخانە: کەمال
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
نرخ: (٢٠٠٠) دینار
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٨٦٣)ی ساڵی (٢٠١٧)ی پێدراوە
ناونیشان: سلێمانی/ شەقامی سالم- پشت کتێبخانەی گشتی
☎ : ٣٣٠١٩٤٩

## ناوەرۆک

# هەر شادییە لە دێ بچکۆل

من ناوم سارایە و لە دێ بچکۆل دەژیم. ئێستا تەمەنم نۆ ساڵە. دایکم دەڵێت دەبوایە ئاواییەکەمان ناوی ئاوایــی گرمەگرم بوایە. چونکــە هەمیشە منداڵانی دێ بچکۆل خەریکی دەنگەدەنگ و گرمەگرم کردنن. کەس لەو بڕوایەدا نییە، کە تەنها شەش منداڵ ئەوەندە بەزم و هەرا و گرمەگرم و دەنگەدەنگ بکەن.

من لەو بڕوایەدام تەنها شڤانی برام، بە قەدەر دە منداڵی ئاقڵ و سەلار گرمەگرم و دەنگەدەنگ دەکات. شاد و هەستیاریش لە شڤان کەمترنین. بەلای کەمەوە من و هانا و هاوبەش زۆربەی کات بێدەنگ و ئاقڵین.

ئەگەر یەکێک بهاتایە بۆ سەردانمان، دەبوایە سەرانسەری ڕێگاکە بــە هەورازدا سەربکــەوتایە. ئەمــەش لەبەرئەوەی کــاتی خۆی ئاواییەکەمان لــە بەرزاییدا دروستکــراوە، ئەگەر ئاواییەکەمان لــە شوێنێکــی تۆزێک لەمە بەرزتــر دروستبکــرایە، ئەوا دەمانتوانــی بەکەمانێک ئەستیرەکان لە ئاسمان دابگرینە خوارەوە.

تا چــاو بڕدەکات، لــە دەوروبەرمان هەر دارستانە. کەچــی جاروبار خەڵکی لــە شارەکانەوە دێن بــۆ سەیرکردنــی دیمەنی جــوانی ئاواییەکەمان.

جارێکیان ژنێکـی جوانی شـاری بە ئۆتۆمبێل هات بـۆ لامان، کچێکیشی لەگەڵبوو . ژنەکە وتی:

"هاتووین بۆ سەیری دیمەنی جوانی ئاواییەکەتان."

ژنەکە کڵاوێکی سووری بە سەرەوە بوو، چاکەتێکی سووریشی لە بەرادابوو. کچەکەشی کراسێکی شینی کاڵی لەبەردابوو، گوڵێکی زیوینیشی کردبوو بە یەخەی کراسەکەیەوە. کچەکە ناوی شەن بوو، هەر بـە هاوتەمەنی خۆم دەچوو. کـە دایکم ئەوانی بینی، فەرموی لێکردن، پێی وتن دەبێت تۆزێک لە لامان بمیننەوە و، بە منیشی وت بڕۆم لەگەڵ شەندا قسە بکەم.

من حەزمدەکرد هانا و هاوبەش لە ماڵ بوونایە بۆئەوەی ئەوانیش قسەیان لەگەڵ شەندا بکردایە. بەڵام بە داخەوە ئەوان لە ماڵەوە نەبوون، بە ئیش نێردرابوون بۆ گەورەدێ.



شڤان و شاد و هەستیار لـە ماڵەوە بوون. نەخێر خۆ ئەوان بێزیان نەدەهات قسە لەگەڵ کچاندا بکەن. ئەوان خۆیان مەڵاسدابوو، جاروبار سەیرێکیان دەکردین و قسەیەکیان دەکرد و دەستیاندەکرد بە قاقای پێکەنین.

شەن سەیرێکی کورەکانی کرد و پرسیاری لێکردم:

"ئەرێ ئەمانە! هەموویان براتن."

"نا تەنها شڤان و شاد برامن. هەستیار دراوسێمانە."



شەن وتی:

"کامەیان هەستیارە؟"

"ئەوەیان، کە قژی تەنکە!"

شڤان سواری دارشەقەکانی ببوو. ئەو دارشەقانە ناڵێم کە کەسانی کەمئەندام و نەخۆش پێی دەڕۆن.

بەڵکو دارشەقی یاریکردنم مەبەستە، کە نزیکەی دوو مەتر بەرزن و جێی قاچ و دەستیان بۆ کراوە.

من دڵنیابووم شڤان بۆیە سواری ئەم دارشەقانە بووە، بۆئەوەی لەبەرچاوی شەندا خۆی بنوێنێت. شڤان بە سواری دارشەقاکانەوە دەیتوانی لە پەنجەرەکانەوە سەیری نهۆمی دووهەمی خانووەکەمان بکات.

جارێکیان کە من لە ژوورەکەم یاریمدەکرد لەگەڵ بوکەشووشەکانمدا. لەپڕ شڤان سەری لە پەنجەرەی ژوورەکەمەوە هێنایە ژوورەوە و کڵاوەکەی سەری لابرد و بەرێزەوە وتی:

"ڕۆژ باش گوڵەکەم، ئەرێ ئێوە دڵشادن بەم ئێوارە خۆشە؟"

یەکەمجار زۆر ترسام بەڵام کە بینیم شڤان بوو بە دارشەقەکانی دەڕوات ئیتر دڵم هاتەوە شوێنی خۆی. ئەوجارە شڤان یەکەمجاری بوو دارشەقەکان تاقی بکاتەوە.

بەڵام ئێستا شڤان بە هەلیزانی لە پێش چاوی شەندا خۆی بنوێنێت. لە پاخچەکەماندا شڤان بە سواری دارشەقەکانی دەهات و دەچوو هاواریدەکرد، کە ئەو دیمەنی زۆر جوان دەبینێت.

باجی توبا ئیشکەرەکەمان لە تەنیشت دەرگای موبەقدا، تەنەکەی خۆڵی دانا. خوا کردی دارشەقەکانی شڤان بەرتەنەکەکە کەوتن و کەوتنە ناو پاشماوەکانەوە. شاد و هەستیاریش لە خۆشیاندا هاواریانکرد:

"دەزانی چی شڤان؟ ئێستا ئێمە جوانترین دیمەن دەبینین."

شڤان ڕایکرد بۆ حەمامەکە، لەبەر بەلۆعەکە جلەکانی پاککردەوە.

زۆری پێنەچوو شڤان هاتە دەرەوە هەموو گیانی تەڕببوو. بەڵام ئەو عاری نەنا، وەکـو ئەوەی نەبای بینی بێت و نەباران. سـەری ڕادەوەشاند و بە ئەنقەست ئاوی قژە تەڕەکەی دەپژان بە دەموو چاوماندا. دوایی شڤان ڕوویکردە شەن و بە زەردەخەنەوە پێیوت:

"دەبێت جاروبار مرۆڤ شتی خۆش بکات بۆئەوەی خەڵکی بهێنێتە پێکەنین."

دایکم هاواری لە شڤان کرد کە بچێت جلە تەڕەکانی بگۆڕێت. زۆری پێنەچوو شڤان بەگرمەگرم هاتە دەرەوە و دانیشت لە لامان و دەستیکرد بە قسەکردن لەگەڵ شەندا.

هەستیار بێدەنگبوو. چونکە ئەو قسەی لەگەڵ خەڵکی نەناسراودا نەدەکرد. بەڵام هەرچۆنێکبوو دەمی هاتەگۆ و بە شەنی وت:

"من خوشکێکی بچکۆلەی جوانم هەیە، حەز دەکەیت بیبینیت؟"

هەستیار بە ڕاکردن چووە ماڵەوە و نازەی خوشکی هێنا. نازە تەمەنی تەنها ساڵ و نیوێک بـوو. هەستیار نازەی ئێجگار خۆشدەویست. ئەمەش شتێکـی سەیر نەبوو چونکە نازە زۆر جـوانە و خوشکی تاقانەشیەتی.

هەستیار نازەی لە باوەشی شەن دانا. نازە کەوتە ڕاکێشانی قژی شەن دەیویست تەوقەکەی قژی لێبکاتەوە. بەڵام شەن دڵ زویر نەبوو، چونکە ئەو دەیزانی کە منداڵی بچکۆلانە ئەو شتانە دەکەن.

من دیقەتـی گوڵە زیوییەکەی بەرۆکـی کراسەکـەی شەنمدا و بەلامەوە جوانبوو. بۆیە پێموت:

"ماشەڵڵا کە گوڵێکی جوانە."

شەن پێی وتم:

"پێشکەشت بێت."

من گوڵە زیوینەکەم نەدەویست، تەنها بەلامەوە جوان بوو. هەر لەبەر ئەوەش بوو وتم جوانە. شەن گوڵەکەی لە بەرۆکی کردەوە و خستییە دەستم و دایکیشی پێی وتم کە دەبێت گوڵەکە وەربگرم، هەرچەندە دایکم وتی:

"نا.. نا.. بە خودا شتی وا نابێت."

من گوڵە زیوینەکەم وەرگرت کە پڕبوو لە مووروی سوور لە ژیانمدا گوڵی واجوانم نەبینیبوو. من گوڵەکەم خستە ناو قوتوویەکەوە و قوتووەکەم لەسەر کۆشم دانا. زۆری پێنەچوو هانا و هاوبەش لە گەورەدێوە هاتنەوە بۆ ماڵەوە. کە سەیارەکەیان بینی، واقیان وڕما و زەقزەق سەیریان دەکردین چونکە بە دەگمەن سەیارەی بێگانە دەهات بۆ سەردانمان و ڕێگاکەش تەسک و ناخۆش و پێچا و پێچ بوو. دایکم و دایکی شەن دانیشتبوون لە باخچەکەماندا و چایان دەخواردەوە و ئێمەش قسەمان لەگەڵ شەن دەکرد. هانا و هاوبەش لە نزیکی پەرژینەکەی ماڵی خۆیاندا وەستابوون و شەرمیاندەکرد

بێن بۆ لامان، منیش هاوارم لێکردن:
"ئەوە بۆ وەستاون و سەیرمان دەکەن دەڵێی قەت ئێمەتان نەبینیوە؟"
ئینجا ئەوانیش هاتن و سڵاویان کرد لە شەن، شەن وتی:
"ئەری ئەم ئاواییە چەند منداڵی تێدایە؟"

شڤان وەڵامی دایەوە:
"شەش منداڵ و نیو."
چونکە شڤان لەو بڕوایەدا نەبوو نازە
حیسابی منداڵێکی گەورەی بۆ بکرێت.
هەستیار دڵی زویر بوو بۆیە بە
شڤانی وت:
"خوشکەکەی من نیوە زەلام نییە،
بەڵکو تۆ خۆت لە نیوە زەلامیش کەمتریت."
من بۆ شەنم گێڕایەوە کە هانا و هاوبەش لە خانووەکەی لای چەپی ئێمەوە دەژین و ئێمەش لە ناوەڕاستدا و ماڵی هەستیاریش لەلای ڕاستمانەوەن.
شەن وتی:
"من زۆر حەزدەکەم لە شوێنێکی وا خۆشدا بژیم."
کاتێک کە دایکی شەن لە چا خواردن بووەوە و ماڵئاوایی لێکردین و جارێکیتر سەیری دیمەنە جوانەکانی کرد و بە دایکمی وت:

پرسیارێکم هەیە، نازانم بیکەم یان نا."
دایکیشم وتی:
"فەرمووو."
ئەرێ ئێوە تاقەتتان ناچێت لەم چۆڵەوانییەدا. تاچاو بڕدەکات هەر دارستانە."
دایکیشم وەڵامیدایەوە: "ئێمە ئەوەندە سەرمان قاڵە بە ئیشوکارەوە، کاتمان نییە بیر لەو شتانە بکەینەوە."
من هەستمکرد کـە دایکی شـەن تۆزێک فیزی نواند بەسەرماندا، بۆیە ئەو پرسیارەی لـە دایکم کرد. ژیانی ئێمە نە ناخۆشە و نە سادەشە. من لەو بڕوایەدام کـە لێرە ئێمە ژیان زۆر خۆشتر بە سەردەبەین لە خەڵکی شار.
زۆری نەبرد شەن و دایکی کەوتنەڕێ، ئێمەش خواحافیزیمان لێکردن و دەستمان ڕاوەشاند هەتا ئەوان لە چاومان ونبوون.
من بیرم لەوە دەکردەوە کە هەرگیز جارێکیتر شەن نابینینەوە. ئەو یادگارییەی کە لەلام مایەوە گوڵە زیوینەکەی بوو. منیش ڕێگامدا بە هانا و هاوبەش سەیری گوڵە زیوینەکەم بکەن و جاروباریش ئەگەر ویستیان بۆ ماوەیەک لێم وەربگرن.
دوایی ڕامانکرد بۆ لای باپیرە. ئەو لە ماڵی هانا و هاوبەش دەژیا. ئەو باپیرەی ئەوان بوو، چاوی بە ئاستەم شتی دەبینی.

باپیره زۆر حەزیدەکـرد چی لـە ئاوایەکەماندا ڕوویبدایە، ئێمە بۆ ئەوی بگێڕینەوە. ئێمەش خۆ نەدەبوو باسی ئۆتۆمبێلەکە و گوڵە زیوینەکە و شەن و دایکی شەنی بۆ نەکەین. باپیرە لەو بڕوایەدابوو، ئەگەر منداڵان نەبونایە ئەو هەرگیز نەیدەزانی چی لە ئاواییدا ڕوودەدات. چونکـە پیاوە گەورەکانـی دێکەمان خەریکی ئیشـی خۆیان بوون، ئەوان کاتی ئەوەیان نەبوو، ڕووداوەکانی ئاوایەکەمان بـۆ باپیرە بگێڕنەوە. ئێمە بوویـن هەموو شتێکمان بـۆ باپیرە دەگێڕایەوە. ئەو دەیویست زیاتر باسی ئۆتۆمبێلەکەی بۆ بکەین. شاد دەیزانی بە جوانی باسی ئۆتۆمبێلەکەی بۆ بکات چونکە شادی برام زۆر حەزی لە ئۆتۆمبێل بوو. باپیرە گوڵە زیوینەکەی منی گرت بە دەستەوە. من بۆمباسکـرد کە گـوڵە زیوینەکە پڕە لـە مووروی سووری بچکۆلانە. باپیرەش پێی وتم کە ئەو لە ناو سەریدا هەموو ئەو جوانییە دەبینێت بۆیە دەزانێت کە گوڵەکە زۆر جوانە.

دوایش بۆ باپیرەم گێڕایەوە، کە چۆن دایکی شەن فیزی کردووە بەسەر دایکمدا و وتویەتی، کە ژیانی ئێمە ناخۆش و سادەیە. باپیرە سەری ڕاوەشاند و وتی:

"هۆهۆیایا، خەڵکی شار خۆیان بە گەورە نیشاندەدەن."

باپیرەش هەر بە تەواوەتی وەکو من بیری دەکردەوە، بەلای ئەویشەوە تەنها لە دێ بچکۆل خۆشی و شادی بەردەوام بوو.

# بووم بەخاوەنی بەرخی خۆم

من و هاوبەش جاروبار بیردەکەینەوە، خۆشترین وەرزی ساڵ دەبێت کام وەرزە بێت. بە ڕای من بەهار خۆشترین وەرزی ساڵە. بەڵام بە لای هاوبەشەوە، هاوین خۆشترین وەزی ساڵە. بەلای من و هاوبەشەوە ڕۆژانی جەژنیش زۆر خۆشن، ئیتر لە جەژنی نەوروزەوە بگرە تا جەژنی ڕەمەزان و قوربان.

ئێستا ئەو بەسەرهاتەتان بۆ دەگێرمەوە، کە چۆن بووم بە خاوەنی بەرخی خۆم. ئێمە خاوەن مەڕومالاتین و لە بەهاراندا ئەوان زاوزێ دەکەن. بەرخ جوانترین کاژۆڵەیە لەناو گیاندارااندا. ئەوان لە بەچکە پشیلە و توتکە سەگ جوانترن. بە لای منەوە جوانتریشن لە نازە، خوشکە بچکۆلانەکەی هەستیار. هەر چەندە من ناوێرم ئەمە بە ئاشکرا بڵێم چونکە هەستیار دڵی لێم زوویر دەبێت.

ئەو دەمەی کە مەڕ دەزێت، ئێمە ڕۆژانە، چەند جارێک دەچووین بۆ گەوڕەکەمان بۆ ئەوەی بزانین چەند بەرخی تازە لەدایکبوون. کاتێک کە دەرگای گەوڕەکەمان دەکردەوە هەموو مەڕەکان خەریکی باعەباع بوون. بەرخەکان بە دەنگێکی ناسک و شیرین دەباعێنن. بەڵام دایک و باوکانیان دەنگیان ناسازە، وەکو بەرخەکان باعەباع کردنیان خۆش نییە. هەموو مەڕێک ساڵی یەک یان دوو بەرخی دەبێت.

بەیانییەکیان، ڕۆژی یەکشەممە بوو، کاتێک کە من چوومە گەوڕەکەوە بەرخێکی مرداربووەوەم بینی کە لەناو گەوڕەکەدا کەوتبوو.
بە ڕاکردن چووم بۆ لای باوکم و بۆمگێڕایەوە. باوکیشم هات بزانێت بۆچی ئەو بەرخە مرداربووەتەوە.
من لە دالانی گەوڕەکەمان دانشتبووم و لەپڕ دەستمکرد بە گریان. زۆرم پێناخـۆش بوو، ئەو بەرخە نازدارە لـە برساندا مردبوو. هەر لەبەرئەوەی دایکەکەی شیری لە گووانیدا نەبوو تاوەکو شیری بداتێ. زۆری پێنەچوو هاوبەشیش هات. منیش کە بۆ هاوبەشم گێڕایەوە چۆن ئەو بەرخە جوانە مرداربووەتەوە، ئەویش دەستیکرد بەگریان.
من بە چاوی فرمیسکاوییەوە بە باوکمم وت:
"من زۆرم پێناخۆشە، ئەو بەرخە نازدارە مرداربووەتەوە."
باوکیشم وەڵامی دامەوە:
"کچم، ڕاستدەکەیت. کێ ئەوەی پێخۆشە، بەس بەداخەوە بەرخێکی تریشمان لە دەست دەچێت."
باوکم ئەمەی وت و ئیشارەتێکی کـرد بۆ ئەو بەرخەی کـە لە باوەشیدابوو. بەرخەکـەش باش دیار نەبوو، چونکـە ئەویش برای بەرخە مرداربووەکە بوو. دایکیان شیری نەبوو بیدات بە بەرخەکانی، خۆ شیریش تەنها شتێک بوو کە بەرخ دەیخواردەوە. لەبەر ئەوەش بوو باوکم دەیـوت دەبێت برای بەرخە مرداربووەکـە سەرببڕین،



نەوەکو ئەو قورپەسەرەش لە برساندا بمرێت.
کە گوێمان لەمە بوو، من و هاوبەش پێکەوە دەستمانکرد بەگریان و هاوارکردن.
"من نامەوێت بەرخەکە بمرێت"
باوکم باوەشی پێداکردم و وتی:
"ڕۆڵە سارا گیان مەگری، ڕۆڵە مەگری."
دوایش باوکم پێی وتم:
"دەتوانیت بە مەمکەشووشە شیر بە بەرخەکە بدەیت. هەر وەک چۆن شیر دەدرێت بە منداڵی ساوا."
ئەی خودایە کە دڵشادبووم. هەرگیز لەو بڕوایەدا نەبوم کە پێشتر ئەوەندە دڵشادبووبم. من پێشتر نەمدەزانی کە بەو شێوەیە دەتوانرێت، شیر بدرێت بە بەرخ وەکو چۆن شیر دەدرێت بە منداڵێکی ساوا.



باوکم بۆی ڕوونکردمەوە کە تەنها ئەمە هەوڵێکە و دەیدەین. ئەو زۆر دڵنیا نەبوو کە هەوڵەکەمان سەردەگرێت.

هاوبەش خێرا ڕایکرد بۆلای دایکی هەستیار. شووشەیەک و مەمکەمژەیەکی لەلا هێنا، کە کاتی خۆی هی نازە بوو، کاتێک کە ئەو منداڵێکی ساوابوو. دوایی لە باوکمم پرسی:

"بابەگیان. بۆمان هەیە، تۆزێک نان و قەیماغ بدەین بە بەرخە نازدارەکەمان."

باوکم وتی نەکەن شتی وا بکەن. نان و قەیماغ نەدەن بە بەرخەکە چونکە نەخۆش دەکەوێت. سکی بەرخ تەنها بەرگەی شیر دەگرێت، کە ئەویش دەبێت تۆزێک ئاوی لەگەڵدا تێکەڵ بکرێت. باوکم یارمەتیداین، ئاو و شیرەکەمان لەگەڵ یەکتریدا تێکەڵکرد و مەمکەشووشەکەم لە ئاوی گەرمدا گەرمکردەوە.



کاتێک مەمکەشووشەکەم خستە
ناودەمی بەرخەکەوە، یەکسەر
بەرخەکە کەوتە مژینی شیری
ناو مەمکەشووشەکە.
بە ئاسانی بۆمان دەرکەوت کە
بەرخەکە زۆر زۆر برسی بوو. باوکم پێی وتم:
"ئافەرم کچم، لە ئێستاوە بووی بە بەخێوکەر و دایکی ئەو بەرخە جوانە. ئیتر نابێت تاقەتت بچێت، بەیانی و ئێوارە دەبێت شیری بدەیتێ."
هاوبەش وتی ئەگەر تۆ تاقەتت چوو بە من بڵێ. ئەوا بە دڵخۆشییەوە من شیر دەدەم بە بەرخەکە، بەلام من بە هاوبەشم وت:
"هەها، تۆ لەو بڕوایەدای کە من ڕۆژێک لەڕۆژان تاقەتم لە شیردان بە بەرخەکە بچێت."
من بەرخەکەم ناونا، خوری. باوکیشم وتی کە خوری تەواو هی خۆمە. بەختم هەبوو هەموو شت بڕایەوە پێش ئەوەی براکانم لە خەو هەستن. ئەگینا ئەوان گێچەڵێکیان لەسەر خوری دەنایەوە.
شڤان وتی:
"دەوەرە! بەیانییەک درەنگ لە خەو هەستام، سارا بەرخێکی دەسکەوت منیش بەرخێکم لە کیسچوو."

شڤان ئیرەیی پێدەبردم کە بووم بە خاوەنی بەرخی خۆم. لە سەرەتادا هەرچی منداڵ هەیە لە دێکەماندا شیریاندا بە خوری، بەڵام هەموویان دوای ماوەیەک تاقەتیان چوو.

زۆر سەیرە، کە بە گشتی بەرخ تێر بوونی بۆ نییە، هەمیشە برسییانە.

هەموو ڕۆژێک پێش ئەوەی کە بڕۆم بۆ قوتابخانە دەچووم بۆ گەوڕەکە و شیرمدەدا بە خوری. هەر کە دەیبینیم خێرا ڕایدەکرد بۆلام و دوگی دەلەرییەوە و باعەباعێکی شیرینی بۆ دەکردم.

خوری تەواو سپی بوو، پەڵەیەکی ڕەش بەلوتییەوە بوو. من دەمتوانی بە باشی خوری جیابکەمەوە لە بەرخەکانیتر. کاتێک لە قوتابخانە بووم باجی توبا ژەمێک شیریدەدا بە خوری بەڵام هەر کە گەڕامەوە ماڵەوە، خۆم دەبوایە شیربدەم بە بەرخەکەم. شەو درەنگیش بەرخەکەم دەبوایە ژەمێکی تریش شیری بخواردایە. جارێکیان بە هاوبەشم وت کە بچێت شیر بدات بە خوری، کەچی ئەو پێی وتم: "بەیانی! ئێستا تاقەتم نییە."

بەڵام خۆم بەڵێنم دابوو بە باوکم کە لە شیرپێدان قەت تاقەتم نەچێت و هەروەها تەنها جارێکیش تاقەتم نەچوو. چونکە من خوریم زیاد لە ئەندازە خۆشدەویست.

خۆشترین شت ئەوەبوو، خوری دڵی دەکرایەوە کاتێک کە منی دەبینی. لە خوری وابوو کە من دایکیم.

من له شڤان و شادم پرسی:

"ئایا ئێوه لەو بڕوایەدان، کە خوری وا بزانێت من دایکی ڕاستەقینەی ئەوم. شڤان وەڵامیدامەوە: "بێگومان. خوری وا دەزانێت تۆ دایکی ئەویت، چونکە سارا تۆ هەر لە مەڕ دەچیت."

باوکم پێی وتم ئیتر کاتی ئەوە هاتووە کە خوری لە مەمکەشووشە ببڕمەوە و فێری بکەم خۆی لە سەتڵدا شیر بخواتەوە. چونکە خوری گەورەیە و خۆ ناکرێت تا ئەو دەبێت بە کاوڕ هەر مەمکەشووشەی بە دەمەوە بێت.

قووڕ بەسەر خوری تێنەدەگەیشت، بۆچی من سەتڵە شیرەکەم نزیکی لوتی دەکردەوە. ئەو نەیدەزانی چۆن شیرەکە بخواتەوە. خوری بە خەمبارییەوە دەیباعان و هەر لوتی پێوە دەنام وەکو لێم بپرسێت کوا مەمکەشوشەکەم. شاد لە تەنیشمەوە ڕاوەستابوو سەیریدەکرد و دوایی بە خوری وت: "گێژە! شیرەکە بخۆرەوە."

من زۆر ڕقم هەستا لە شاد و بەتوندی پێموت:

"خوری گەمژە نییە، تۆ نازانی چۆن لەگەڵ بەرخدا قسە دەکەیت."

بەڵام خوری هەر لوتی دەنا بە شیرەکەوە و هەر باعەباعی بوو. من بەهەرحاڵ لە شاد چاکتر دەمزانی چۆن بەرخ بەخێودەکرێت. من فێڵێکم لە خوری کرد، پەنجەمکرد بە شیرەکەدا بۆئەوەی خوری خەریکی مژینی پەنجەکانم بێت.

شیرەکەی خواردەوە، بەڵام هەڵبەتە تۆزێکی لە شیرەکەی ڕشت بە دەوروبەری سەتڵەکەدا.

بەیانییەک کە خوری تەواو تەواو برسیبوو، چاوەڕێی منی نەکرد پەنجە بخەمە ناو شیرەکەوە. ئەو یەکسەر دەستیکرد بە شیر خواردنەوە. دوای ئەوجارە ئیتر هەرگیز پێویستی نەکرد کە پەنجەکانم بمژێت لە کاتی شیرخواردنیدا. لە ڕاستیدا ئەمەم بەلاوە ناخۆش بوو چونکە ئەو کاتە خۆش بوو کە خوری پەنجەکانمی دەمژی.

لە بەهاردا ئاووهەوا گەرمە بۆیە مەڕومالاَت بەرەڵا دەکەینە ناو لەوەڕگا پەرژینکراوەکەمان تاوەکو بەرخەکان فێری گیا خواردن بن، هەرچەندە ئەوان بە هەرحاڵ شیریش دەخۆن. منیش هەموو ڕۆژێک دەڕۆیشتم بۆئەوێ و لەگەڵ خۆمدا سەتڵێ شیرم بۆ خوری دەبرد. کە لای دەرگای لەوەڕگاکە دەوەستام و بانگــی خوریم دەکــرد. هەر کــە خوری گوێی لە دەنگی من دەبوو لەوســەری لەوەڕگاکەوە بە خێرایی بەرەو ڕووم دەهات. ئێستا خوری گەورەیە. چیتر شیر ناخوات. ئەو تەنها گەلاَو گیا دەخوات. خوری زۆر زیرەکە و ڕۆژێک دێت کە بەرانێکی ئازا و زیرەکی لێدەربچێت.

لەوانەیە کە گەورەبووم ببمە خاوەن مەڕومالاَت و سەگ و پشیلە و کەروێشکی خـۆم. بەڵام من هەرگیز بڕواناکەم کــە ئەمانەم ئەوەندەی خوری خۆش بوێت.

# خوری دەچێت بۆ قوتابخانە

شڤان حەزیدەکرد تووڕەم بکات، ئەو هەمیشە پێی دەوتم:
"جا بەرخ چییە هەتبێت. خاوەنی سەگ بیت خۆشترە لەوەی بەرخت هەبێت"
هەستیاریش چونکە خۆی سەگی هەبوو لایەنی شڤانی دەگرت:
"لەوە خۆشتر نییە، کە خاوەنی سەگی خۆت بیت."
منیش وەڵامم دایەوە:
"باشە بۆچی سەگ دەبێت خۆشتر بێت، سەگ بە کەڵکی چی دێت."
هەستیار وەڵامی دامەوە:
"سەگ بە وەفایە و دەتوانیت بیبەیت بۆ هەموو شوێنێک. ئەو دوای خاوەنەکەی دەکەوێت بۆ هەر کوێیەک بڕوات."
شڤان وتی:
"بەداخەوە خوری هەر وەک شێت دێت و دەڕوات لە مێرگە پەرژینکراوەکەیدا."
هاوبەش هات بەکۆمەکمەوە:
"بەڵام هەرچۆنێک بێت بەرخ زۆر زۆر لە سەگ جوانترە."
شڤان وتی:
"ئینجا جوانی چ کەڵکێکی هەیە، کە خوری هەمیشە وەکو شێت

بڕوات و بێت لە مێرگێکی پەرژینکراودا."
ڕۆژی دوایی ڕۆیشتم بۆ لەوەڕگاکە و هاوارمکرد لە خوری. کاتێک خوری بە ڕاکردن بەرەو پیرم هات، لە بەرچاوم زۆر شیرین بوو، قەستمبوو بیخۆم. ئەوەم بە بیردا هات، خوری نەگۆڕمەوە بە هەزار سەگ. من بیرم لەوە کردەوە، کە بەرخەکەم بەستەزمانە و تەنهایە لە مێرگە پەرژینکراوەکەیدا. کەسێک نییە بیبینێت کە چەند جوان و شیرینە.
جاروبار بازە پیشەی بوو کە دوای هەستیار بکەوێت هەتا قوتابخانە. ئەوەش لەبەرئەوەی کە هەستیار وتبوی سەگ دوای خاوەنەکەی دەکەوێت بۆ هەر شوێنێک بڕوات. جارێکیان مامۆستاکەمان ڕێگایدا بازە بێتە ناو پۆلەکەمانەوە. بازە لە نزیک مێزەکەی هەستیاردا پاڵکەوتبوو.
بەڵێ، ئەوە بازە بوو! بەڵام با بەرخەکەی من، هەر بەتەنها فڕکەی بێت لە مێرگە پەرژبنکراوەکەیدا. خۆری شیری دەخواردەوە لە سەتڵەکەدا. من پێمناخۆش بوو کە شڤان گاڵتەی پێکردم و هەروەها ناهەقییەکی ئێجگار گەورەیە سەگ بۆی هەبێت بڕوات بۆ هەموو شوێنێک بەڵام بەرخ نا. کاتێک کە خوری شیرەکەی خواردەوە. بڕیارمدا خوری لەگەڵ خۆم ببەم بۆ قوتابخانە بۆئەوەی شڤان و هەستیاری پێ بێدەنگبکەم.

قوتابخـانەکەمان لـە گەورەدێ بـوو، هەمـوو بەیـانییەک زوو دەڕۆیشتین بۆئەوێ. من بە بۆنەی خورییەوە، ڕۆژانە زەحمەت بوو لە کاتی خۆیدا فریای قوتابخانە بکەوم. چونکە کە لە خەو هەڵدەستام یەکسەر دەڕۆیشتم بۆ لەوەڕگاکەمان و سەرم لە خوری دەدا. سەر لە بەیانی بوو کە بڕیارمدا خوری لەگەڵ خۆمدا ببەم بۆ قوتابخانە. هانا و هاوبەش و شڤان و شاد و هەستیار لە دەرەوەی لەوەڕگاکە چاوەڕێیان دەکردم. هانا هاواریکرد:

"خێراکە سارا، ئەگینا لە قوتابخانە دوا دەکەوین."

منیش ئاوڕێکم لە خوری دایەوە و هاوارم لێکرد:

"خێراکە، خوری، با لە قوتابخانە دوانەکەوین."



هەرگیز مـن ئەوانم وا بـە حەپەساوی نەبینیبوو. مـن بەڵێنتان دەدەمێ کە هەموویان بە تەواوەتی پەشۆکابوون.

شڤان هاواریکرد:

"ناشێ خوری لەگەڵ خۆت بهێنیت بۆ قوتابخانە؟"

منیش بە شڤانم وت:

"خوری لەگەڵ خۆم دەهێنم بـۆ قوتابخانە. تاکۆتایی بەو هەموو چەنەبازییە بهێنم، کە تەنها سەگ دەتوانێت دوای خاوەنەکەی بکەوێت بۆ هەموو شوێنێک."

شڤان وتی:

"سارا، ئەرێ تۆ دڵنیای کە تێکنەچووی. ئەقڵت لە جێگەی خۆی ماوە."



شاد پرسیاری لێکردم. ئایا مۆڵەتم لـە دایک و باوکم وەرگرتووە کە خوری ببەم بۆ قوتابخانە. لەپڕ دەموچاوم سووربووەوە و دڵم کەوتە لێدان، چونکە من بیرم لەوە نەکردبووەوە. باشبوو هاوبەش فریامکەوت و ئەو دەستیدا بەیەکدا و بە پێکەنینەوە وتی:

"ئەگەر سەگ بۆی هەبێت بڕوات بۆ قوتابخانە، بۆچی دەبێت بەرخ بۆی نەبێت."

بەخودا هەرئەمەش لەبیری مندابوو. لە هەمووی خۆشتر ئەوەبوو کە شڤان لەپڕ هاواریکرد:

"با خوری ببەین بۆ قوتابخانە، لەوانەیە مامۆستاکەمان لە خۆشیاندا دڵی بوەستێت."

دوای ئەوە بە ڕاکردن بە لێژاییەکاندا بەرەو قوتابخانە ڕۆیشتین. هەموومان بووین بە خوریشەوە. جاروبار خوری تۆزێک ڕادەوەستا وەکو بڵێی لەوە بکۆڵێتەوە، ئایە ئەو بۆی هەیە دوامان بکەوێت یان نا. ئینجا باعەیەکی شیرینی دەکرد و بە فڕکانێک پێمان دەگەیشتەوە. تۆزێک لـە جاران زیاترمان پێچـوو، کاتێک گەیشتین، زەنگـی قوتابخـانە تازە لێدرابوو، قوتابییەکان لـە پۆلەکەماندا دانشتبوون. ئێمەش هەمووومـان بیست و سێ قوتابی بوویـن و تەنها یەک مامۆستامان هەبـوو، بۆیە پۆلی یەک و دوو و سـێ پێکەوە، لە هەمان پۆلدا دەمانخوێند.

قاچی خوری خزا، کاتێک سەرکەوتین بە پێپلیکانەکانی قوتابخانەکەماندا، منیش چووم بە دەمییەوە و شڤان وتی:

"من بزانم خوری، کاتی قوتابخانەی نەهاتووە".

چەند ساڵێک لەمەوبەر. ئەوکاتەی یەکەمجار شڤان چوو بوو بۆ قوتابخانە، دەقیقەیەک چییە نەیتوانیبوو ئۆقرە لەسەر کورسییەکەی بگرێت. بۆیە مامۆستاکەمان بە باوکمی وتبوو: شڤان کاتی قوتابخانەی نەهاتووە. دوایش شڤانیان ناردبووەوە بۆماڵەوە، بۆ ئەوەی ساڵێکیتر بچێتەوە بۆ قوتابخانە. ئەو منداڵ بووە و پێویستی بەوە بووە، کە لە ماڵەوە بێت تا کاتی قوتابخانەی دێت. تا ئێستاش شڤان ئەمەی لەبیر نەچووەتەوە. بۆیە بە خوری وت ئێستا کاتی قوتابخانەی نەهاتووە.

هانا لە دەرگایدا و ئێمەش یەک بە دوای یەکدا چووینە ژوورەوە، هەموو قوتابییەکان بێدەنگ دانیشتبوون.

"ببورە مامۆستا کە دواکەوتووین."

هانا لە قسەکەی نەبووەوە هەستیار دەستیکرد بە پێکەنین. بەڵام چ پێکەنینێک، وەکو ئەوەی یەکێک ختوکەیەکی ئێجگار زۆری دابێت. مامۆستاکەمان پێیوت:

"ئەوە چییە هەستیار بۆچی پێدەکەنیت لەوە دەچێت دڵت زۆر خۆش بێت؟"

خوریش له دوامانەوەبوو کەس نەیدیبوو، لەپڕ خوری باعەیەکی شیرینی لێوە هات. هەموو منداڵەکان هەڵبەزینەوە لە جێگەکانیان، مامۆستاکەشمان بە سەرسوڕمانەوە پێی وتین:

"ناشێ بەرختان لەگەڵ خۆتاندا هێنا بێت بۆ قوتابخانە."

"بەرخی سارای خوشکمە..."

شڤان ئەمەی وتـو زوو بێدەنگبوو. ئەو حەزیدەکـرد مامۆستاکەمان لە من تووڕە بێت. لەوانەیە واش نەبووبێت بەڵام من خۆم دەترسام وابێت. منیش بە شەرمەوە بە مامۆستام وت:

"مامۆستا ئێمە لە قوتابخانە زۆرجار وانەی گیاندار و باڵندە دەخوێنین، بۆیە بیرم کردەوە کە..."

مامۆستا قسەکەی پێبڕیم و وتی:

"بیرت لە چیکردۆتەوە سارا؟"

"لەوانەیە باشتر تێبگەین ئەگەر بێتو بەرخێکی ڕاستەقینە ببینن."

وەڵام دانەوەکەم گەیشتە فریام. هەرچەندە خوا دەیزانی من پێشتر بیرم لەم وەڵامە نەکردبووەوە. هەر ئەو کاتە لە خۆمەوە ئەو وەڵامە ڕێکوپێکەم بۆ هات. مامۆستاش دەستیکرد بە پێکەنین، هەروەها هەموو هاوڕێکانم دایانە قاقای پێکەنین بەتایبەت هەستیار. ئەو بە جۆرێک قاقای لێدەدا کە خەریکبوو دەبورایەوە. من خوریم بردە لای مێزەکەی مامۆستاکەمان و هەموو منداڵەکان دەستیان هێنا

بە سەریدا. لەوانەی زانیاریدا باسی مەرکرا و منیش بۆمگێڕانەوە کە چۆن بە مەمەکەشووشە شیرمـداوە بە خـوری. دوایی هەمـوو منداڵەکان گۆرانی "بەرخەکەم نەرمونۆڵە" یان بۆ خوری وت.

ئەوەی ڕاستی بێت من لەو بڕوایەدا بووم کە خوری بێتاقەت بوو لـە قوتابخانە و حەزیدەکـرد بڕواتەوە بـۆ لەوەڕگاکەی خـۆی. هەرچەندە ئەو ئاقڵ لە تەنیشمەوە دانشتبوو تا قوتابخانە کۆتایی هات. تەنـها جاروبار باعەیەکـی ناسکی لێوە دەهـات و بازێکـی بچکۆلەی دەدا. هەر جارێکیش خوری ئەمەی بکردایە، هەستیار دەستیدەکردەوە بە پێکەنین. ئەو سەری دەخستە سەر مێزەکەی و تەنها پێدەکەنی. قوتابییەکانی تریش دوابەدوای هەستیار دەستیاندەکرد بە پێکەنین. ئاووهەوا گەرم و خۆشبوو. کە زەنگی پشوودانی لێدا، هەموومـان لە سەر پێپلیکانەکان دانیشتبووین و خەریکـی نان خواردن بووین. من لە شووشەیەکدا شیرم بۆ خوری هێنا بوو. سەتڵێکم لە مامۆستاکەمان قەرزکرد و شیرەکەم تێکرد. هەموو منداڵەکان پێیان خۆش بوو کە سەیری خوری بکەن کاتێک ئەو شیرەکەی دەخواردەوە. هاوبەش نیوەی خواردنەکەی خۆیدا بە من بۆئەوەی من برسیم نەبێت. پاشان خوری لەپڕ چووە ناو باخچەی مامۆستاکەمانەوە و دەستیکرد بە سڵق و پیاز خواردن. باشبوو زوو فریای خوری کەوتم و نەمهێشت زیانی زۆرتر لە باخچەی مامۆستاکەمان بدات.

کاتێک دوای قوتابخانە، بە ڕێگاوەبووین بۆ ماڵەوە. شڤان وتی:
"بەیانی وانەی مانگا دەخـوێنین، بەڵێن بێت بەیانی لەگەڵ خۆمدا مانگایەک ببەم بـۆ قوتابخانە." هەستیار ئەوەنـدە پێکەنی تـا نزگەرەی تووش هات. شڤان درێژەی پێدا:
"لەوانەیە مانگاکە ئەوەندە گەورە بێت لە دەرگای پۆلەکەمانەوە نەچێتە ژوورەوە."
پێش ئـەوەی بڕۆینـەوە بـۆ ماڵەوە، مامۆستاکـەمان پێی وتین، لەمەودوا هیچ قوتابییەک بۆی نییە گیانلەبەر لەگەڵ خۆیدا بهێنێت بۆ قوتابخانە، چونکە هێنانی ئاژەڵ کارێکی نەگونجاوە.
هاوبەش وتی: "ماموستاکەمان ڕاستدەکات، خۆ ئەگەر ئێمە وانەی تیمساحمان هەبێت. ناکرێت لەگەڵ خۆماندا تیمساح ببەین بۆ قوتابخانە."
خوری زۆر ماندووبوو، نەیدەتوانی خـۆی بڕوات. ئێمە بە نۆرە هەڵماندەگرت. کە گەیشتینە ئاواییەکەمان، هەمووومان لەگەڵ خوریدا چووین بۆ لەوەڕگاکە. کاتێک لە ناو لەوەڕگاکەدا خوریمان بەرەڵا کرد. بە غاردان چوو بۆ لای بەرخەکانیتر، هەر باعەباعی بوو بە جۆرێک کە لە سەرانسەری لەوەڕگاکە دەنگی دەدایەوە. شڤان وتی:
"چـیم پـێوتن، خۆ بـە چاوی خـۆتان بینیتان، خـوری کـاتی قوتابخانەی نەهاتووە."

# کە لە قوتابخانەوە دەگەڕاینەوە بۆماڵەوە

ئێمەی منداڵانی ئاوایی دێ بچکۆل پێکەوە کاتمان زۆر خۆش بەسەردەبەرد، بە تایبەت ئەو کاتانەی کە دوای قوتابخانە دەگەڕاینەوە بۆ ماڵەوە. ئێمە قسەوباسمان لەسەر هەموو شتێک دەکرد. جاروباریش چیرۆکمان بۆ یەکتری دەگێڕایەوە. جاری واش هەبوو باسی ئەوەماندەکرد کە گەورەبین ببین بەچی. جاروباریش لە قەراغی شەقامەکە دادەنیشتین و تۆزێک پشووماندەدا. جاری وا هەبوو سەردەکەوتینە سەر دارتوو و سنەوبەر. جاری وا هەبوو لە جیاتی شەقامەکە بەسەر دیوارەکاندا دەڕۆیشتین. ئەمەش هەر لەبەرئەوە بوو، کە هەر جارێک گەڕاینەوە ماڵەوە، گەڕانەوەکەمان تۆزێک جیاوازتر بێت.

دایکم دەیوت:

"من نازانم بۆ ئێوە دەبێت ئەوەندە زۆرتان پێبچێت، کاتێک دوای قوتابخانە دەگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە."

من خۆشم ئەمەم بەلاوە زۆر سەیربوو. بۆ خۆشم نەمدەزانی بۆچی وابوو. ڕۆژێکیان لە بەهاردا، تەواو درەنگ گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە.

دایکم پێی وتم:

"دەبێت لە نوکەوە بۆم بگێڕیتەوە بۆچی وا زۆرتان پێچووە."

منیش بۆ دایکمم گێڕایەوە. یەکەمجار چووین بۆ دوکانەکەی

مامەشێخ. حەڵوامان کڕی بۆ باپیرە. چونکە باپیرە زۆر حەزی لە حەڵوایە. باپیرە حەڵواکەی لە دۆڵابەکەیدا دادەنا و هەرجارێکیش ئێمە بچووینایە بۆ سەردانی حەڵوای بەشدەداین. هانا حەڵواکەی کڕی، ئێمەش داوامانکرد بەشمان بدات هەرچەندە سوور دەمانزانی کە ئەو بەشمان نادات. هانا حەڵواکەی خستە ناو جانتاکەیەوە و پێی وتین:

"ئەگەر هەمووومان تۆزێک لە حەڵواکە بخۆین ئەوا تەنها زەرفێکی بەتاڵ دەبەمەوە بۆ باپیرە."

شڤان وتی: "چاکتر وایە بگەڕێینەوەماڵەوە تا کارەساتێکمان بەسەردا نەهاتووە."

ئێمەش ملی ڕێگای ماڵەوەمان گرت و شاد زۆر حەزی لە نوقڵی ترش و شیرین بوو. ئەو وتی:

"ئەگەر خاوەنی سەدفلس دەبووم شەرت بێت دوافلسم بدایە بە نوقڵی ترش و شیرین."

هاوبەش وەڵامیدایەوە:

"هەر بڵێ بۆ خۆت. تۆ فلسێکیشت پێ نییە."

شاد وەڵامی دایەوە:

"ڕاستدەکەیت، بەڵام وا کردمان سەد فلسم دۆزییەوە."

هاناش وتی: "تۆ و پارە دۆزینەوە! تۆ قەت پارە نادۆزیتەوە، چونکە

هەمیشە لوتت بە حەواوەیە و سەیری باڵندە دەکەیت. پێش هەموو شتێک تۆ جارێ سەیری بەر پێی خۆتبکە."

ئیتر شاد بڕیاریدا کە لەو کاتەوە بە وردی سەیری بەر پێی خۆی بکات. زۆری پێنەچوو، لەو شوێنەدا بووین، کە جادەکە پێچیدەکردەوە بۆ ئاواییەکەمان. شاد سەد فلسییەکی دۆزییەوە. خۆی لە خۆیدا ئەمە موعجیزە بوو. من لەو بڕوایەدام کە پەرییەکی میهرەبان گوێی لە پاڕانەوەی شادی برام بووە و بەزەیی پێدا هاتۆتەوە، بۆیە سەد فلسییەکی بۆ هەڵداوەتە خوارەوە.

شاد لە پێشدا واقی وڕمابوو. زەقزەق دەیڕوانی بۆ سەد فلسییەکە و وەکو ئەوەی شاد بیر لەوە بکاتەوە: تۆ بڵێیت ئەمە خەو ببینێت یان نا. شاد سەد فلییسەکەی هەڵگرت و یەکسەر بە ڕاکردن گەڕایەوە بۆ دوکانەکەی مامەشێخ. هەر هەموو سەد فلسەکەیدا بە نوقڵی ترش و شیرین، هەر وەکو خۆی پێشتر بەڵێنی دابوو. ئێمەش لە دوریانەکە چاوەڕێمانکرد تا شاد گەڕایەوە. کاتێکیش کە ئەو گەڕایەوە نوقڵی ترش و شیرینی بەشی هەمووماندا.

شاد وتی:

"من نەمزانیوە پارە دۆزینەوە ئەوەندە ئاسانە. ئاخۆ لەمەوپێش چەند سەد فلسی و پەنجاییم لەکیسچووبێت، ئەمەش هەر لەبەر ئەوەی بە جوانی سەیری بەر پێی خۆمم نەکردووە."

هەمووومان سەیری بەرپێی خۆماندەکرد و ورد دەمانڕوانی. شڤان وتی: "خۆزگەم بەو کەسەی یەک سەد فلسی دەدۆزێتەوە."

شڤانی برام بە ئاواتەوە بوو، بەڵکو پەرییەک دڵی نەرم بێت و سەد فلسییەکی لە ئاسمانەوە بۆ هەڵبداتە خوارەوە. زۆر گەڕا بەڵام شڤان سەد فلسی نەدۆزییەوە و دوایی وتی:

"خۆزگەم بەو کەسەی یەک پەنجا فلسی دەدۆزێتەوە."

شڤان پەنجا فلسیشی بۆ نەدۆزرایەوە، ئەو بە هەرحاڵ وازی نەهێنا و وتی: "خۆزگەم بەو کەسەی کە دە فلسییەک دەدۆزێتەوە."

شڤان دە فلسیشی بۆ نەدۆزرایەوە. نەک هەر ئەو بەڵکو کەسمان فلسێکیشمان بۆ نەدۆزرایەوە.

شاد زۆر دڵفراوان بوو، نوقڵی ترش و شیرینی تریشی بەشداین. ئەو ویستی پێشبڕکێیەکی نوقڵ دابمەزرێنین. کێ زۆرترین کات دەتوانێت نوقڵێکی ترش و شیرین لەناو دەمیدا بهێڵێتەوە.

هەرحاڵ ئێمە بە پێشبڕکێکەمان دەستپێکرد. هەر یەکەمان نوقڵی خۆمان کردە ناو دەم و هەتا دەمانتوانی لە سەرخۆ دەمانمژی. دوای ماوەیەک کۆبوینەوە لە بازنەیەکدا زمانمان درێژکرد و نوقڵەکانمان بەراورد کرد لەگەڵ یەکتریدا و هانا پێشبڕکێکەی بردەوە.

کاتێک نیوەی ڕێگاکەمان بڕی نزیکی دوکانەکەی بەستەزمانی پینەچی بووینەوە. بەستەزمان لە پەنجەرەی موبەقەکەوە سەرێکی

کێشایە دەرەوە و هاواری لێکردین:
"کامتان تۆزێک ئەقڵی لە مێشکدایە، با بێت پێڵاوەکانی توبا بەرێتەوە."
شڤانیش پێڵاوەکانی باجی توبای خستە ناو جانتاکەیەوە. دوایی هەستیار حەزیکرد پێشبڕکێیەکی دیکە دابمەزرێنین، کێ بتوانێت زیاتر لە هەمووان هەناسەی خۆی ڕابگریت. ئێمەش دەستمانکرد بە پێشبرکێکە بەڵام هەر بۆ دڵنیایی دوورکەوتینەوە لە دوکانەکەی بەستەزمان. چـونکە هەمیشە ئەو بەشک بـوو لێمان. ئێمەش نەماندەویست ئەو لەو چەقی ڕێگایەدا بمانبینێت، ئەو گومانی لێدەکردین کە ئێمە لە وانەیە خەریکی کارێکی نەگونجاو بین.
من دوایــی بۆ دایکمم ڕوونکردەوە. کە ئێمە تەنها لەبەرئەمە دوا نەکەوتبووین لە گەڕانەوەماندا. بەڵام لەوانەیە هەر تۆزێک پەیوەندی بەوەوە بوو بێت کە ماوەیەکی زۆر هەناسەمان نەدەدا.
شڤان واینیشاندا کە ئەو پێشبڕکێکەی بردووەتەوە بەڵام هەستیار بە شڤانی وت:
"نا.. نا.، شتی وا نییە، شادی برات پێشبڕکێکەی بردووەتەوە، ئەو ڕووی لە هەموومان زیاتر شینتر بۆتەوە."
دوایی شڤان وتی:
"با یاری بازبازێن بکەین. بەس نابێت کچان بەشداری تێدا بکەن، چونکە ئەوان لەگەڵ ئێمەدا دەرناچن."

من و هانا و هاوبەش لە کوڕەکان تووڕە بووین و پێمان وتن ئێمە ئەگەر لەوان باشتر بازنەدەین، لەوان خراپتر نین. هانا بە کوڕەکانی وت: ئەگەر کچان بەشدارینەکەن لە بازدانەکەدا، ئەوا ئەو کوڕان بانگهێشت ناکات بـۆ ڕۆژی لەدایکبوونـی. لەبەرئەمە ئێمەش بەشداریمانکرد. وەک هەموو جارەکانیتر شڤانی برام پێشبڕکێکەی بردەوە. هاناش بـە دووەم دەرچوو، چونکـە بازدانی هانا لـە هی هەستیار و شاد درێژتر بوو.

مێرگەکەی بەستەزمانی پینەچی لە بەهاراندا ئاو دەیگرێتەوە و مێرگەکە وەکـو چەمێکی بچکۆلەی لێدەهات. کـە گەیشتینە مێرگەکـە، وەستاین تۆزێک پشـووماندا. شڤان سەیری بەردە گەورەکەی ناو چەمەکەی کرد و وتی:

"من حەزدەکەم لە سەر ئەو بەردە دابنیشم."

ئێمەش هەموو وتمان دەمانەوێت لە سەر بەردەکە دابنیشین. شڤان تەختەیەکی دۆزییەوە. بۆ ئەوەی گیانمان تەڕنەبێت، تەختەکەی دانا وەکو پردێک لەسەری بپەڕینەوە بۆ سەر بەردەکە. شڤان یەکەمجار ڕۆیشت. ئێمەش یەک بەدوای یەک ڕۆیشتینە سەر بەردەکە. ئاووهەوا خۆشبوو، خۆر بوو. هەموو دانیشتین و خۆمان دایە بەر خۆرەکە و زۆر خۆشبوو. هاوبەش وتی:

"خۆزگە شتێکمان پێبوایە، ئێستا بمانخواردایە."

بەڵام هیچمان پێنەبوو. نوقڵەکان تەواو بوون. ئینجا شڤان بەناو جانتاکەیدا گەڕا. لە ناو جانتاکەیدا کتێبەکانی و پێڵاوەکانی باجی توبا و نانە چەورەیەکی تێدابوو، کە شڤان لە پشووی نانخواردنی بەیانیدا نەیخواردبوو. دوایی ئێمە ئەو یارییەمان دامەزراند، کە بەردەکە پاپۆڕێکە و ئێمەش لە دەریایەکی بێسنووردا بێهودە دەخولاینەوە. برسییەتی زۆری بۆ هێنابووین و دەمردین ئەگەر کەس فریامان نەکەوتایە. شڤان نانەچەورەکەی کرد بە شەش بەشی یەکسانەوە و دابەشیکرد بە سەرماندا. شڤان بە خەمبارییەوە وتی:

"برادەران، ئەمە تەنها شتێکە کە جیامانەکاتەوە لە مردن، بەڵام وەکو کابتنەکەتان، ئازا و بەجەرگبن."

هەمیشە وابوو، لەم یاریەشدا شڤانی برام خۆیکرد بە کابتنمان، دوایش وتی:

"لە هەموو شت ناخۆشتر ئەوەیە کە ئێمە ئاویشمان لێبڕاوە، ئەگەر لە برسێتیدا نەمرین ئەوە لە تینواندا دەمرین."

شاد بە شڤانی وت:

"قسەی سەیر. تۆ کوێریت. نابینی سەرانسەری مێرگەکە هەر ئاوە."

شڤان بە شادی وت:

"گەمــژە! ئەو ئاوە سوێرە کــە لە دەوروبەری پاپۆڕەکەمانە. ئــەو کەسەی ئاوی خوێیاوی بخواتەوە شێت دەبێت."

شڤان ڕاکشا له سەر بەردەکە. خۆی وانیشاندا کە برسێتی و تینیوێتی زۆری بۆ هیناوە. شاد وتی: "دەزانن سەرم گێژدەخوات. لەوە دەچێت ئاوی خوێیاویم خواردبێتەوە."

شڤان هەستایە سـەر ئەژنۆ و پەنجەکـانی تەقاند و دەستیکرد بە هاوارکردن:

"بگەنە فریامان.. بگەنە فریامان.."

هاوارەکەی شڤان دەنگی دەدایەوە و تەواو سامناکبوو. کاتێک کە ئەو قیژاندی کێ بێت بە هاوارمانەوە باشە؟ بەستەزمانی پینەچی! ئەو وایدەزانی کە شڤان هاوارەکەی بە ڕاستی کردووە، بەستەزمانیش خۆی چارەی ئێمەی نەدەویست بۆیە وەک زەردەواڵە توڕەبوو لێمان. ئەو وتی:

"منداڵی هاروهاج. پێم ناڵێن بۆ چوونەتە سەر ئەو بەردە. چۆن چۆنی چوونەتە ئەوێ واش وەرنە خوارەوە."

بەڵام هەرچۆنێکبوو پینەچی هاتە ناو ئاوەکەوە. یەک لەدوای یەک هەمووومانی پەڕاندەوە بۆ وشکانییەکە. جلەکانی بەستەزمان تەڕنەبوو چونکە ئەو جزمەی لە پێدابوو. هەموو کاتەکەش قسەی پێدەوتین. بەڵام ئێمە خۆمان وا نیشاندا کە بەستەزمانی پینەچی ئێمەی ڕزگارکردوە. هەرچەندە خۆشمان دەمان توانی بپەڕینەوە بەڵام کەسمان نەماندەوێرا ڕاستییەکە بە بەستەزمان بڵێین. ئەو لەوانەبوو

سەرو چینێکـی لێبدایناتیە. بە ڕاکـردن لەوێوە دەرباز بـووین. بەستەزمانیش هاواریدەکرد و دەیوت کە ئەو شێت بووە بە دەست منداڵانـی دێ بچکۆلەوە. دوبارە پێی وتینەوە کـە واز لە پەرژین و دیواری ئەو بێنین و توخنی مێرگی ئەو نەکەوینەوە. دوایی ئێمە بۆ خۆمان دانیشتین و ویستمان تۆزێک پشـوو بدەین. کاتێک کـە سەیری جانتاکەی شڤانمکرد پێڵاوەکانی باجی توبای تێدانەبوو بۆیە بە شڤانم وت:

"ئەرێ پێڵاوەکانی باجی توبات چی لێکردووە؟"

شڤان حەپەسا. دوایی وتی: کە پێڵاوەکانی لە سەر بەردی ناو مێرگەکەی بەستەزمانی پینەچی بە جێهێشتووە. ئەو کاتەی کە نانە چەورەکەی لە جانتاکەی دەرهێناوە. ئێمەش لەگەڵ شڤاندا گەڕاینەوە بۆ مێرگەکە، چونکە ئێمە بەزەییمان بە شڤاندا دەهاتەوە و حەزماننەدەکرد ئەو بە تەنها بگەڕێتەوە بۆ ئەوێ. بەڵێ.. بەڵێ.،، پێڵاوەکانی باجی توبا کە بە ڕۆژنامەیەکەوە پێچرابوونەوە لە سەر بەردەکە دانرابوون. بەڵام بەستەزمانی پینەچی دارەکانی لابردبوو کە ئێمە وەکو پرد دامانئابوون لە ئاوەکەدا. خۆر بوو، دنیا گەرمبوو.

شڤان وتی: "با هەمووومان بەپێی پەتی بچینە سەر بەردەکە."

ئێمەش چـووین و ئاوەکەش ئەوەنـدە سارد نەبوو. ئێمە ئـەو یارییەمانکرد کە بەردەکە پاپۆرێکـی گەورەیە و ئێمەش چەتەی

دەریایـن و دەبوایە سەرکەوتینایەتە سـەر بەردەکە بۆ ئەوەی ئەو زێروزیوەی کە "پێڵاوەکانی باجی توبا" بوو تاڵانبکەین.
هەمووومان ڕامانکردە ناو ئاوەکەوە و تەقەمان لە چەتەکانیتر کرد. شڤان پێی وتین کە خۆمان بگەیەنینە بەردەکە و چەقۆکانمان بە ددانبگرین. خۆی چەقۆکانمان لقەدارێکبوو، بەڵام ئێمە واماندانابوو کـە چەقۆبن. لـە دواییدا هەمـوو چووینە سەر بەردەکـە و شڤان پێڵاوەکانی باجی توبای بە سەر سەریەوە گرتبوو ڕایدەوەشاند و هاواریدەکرد:
"ئەم زێڕوزیوە هەر بە تەنها هی خۆمانە، مردن بۆ ئەو کەسانەیە کە لێمان نزیک دەبنەوە."



ئینجا بەستەزمانی پینەچی هات. لەو نزیکانەوە کەسێکی تر بێجگە لەو نەبوو. قوربەسەر بەستەزمان. بە ڕاستی من بەزەیم پێدا هاتەوە، کاتێک ئەو ئێمەی بینی بەسەر بەردەکەوە. ئەو تێگەیشت کە ئێمە گاڵتەمان پێکردووە. ئەو بێدەنگبوو، ماوەیەکی زۆر هیچی نەوت. ئێمەش تەواو بێدەنگبووین لـە سەر بەردەکە. بەڵام لـە کۆتایدا بەستەزمان گیانی بۆ هاتەوە و نەڕاندی بەسەرماندا.

"ونبن لەبەر چاوم، بڕۆن تازووە، ئەگینا هەموو گیانتان دەشکێنم."



ئێمەش بە پەلە لە سەر بەردەکەوە بازماندایە ناو ئاوەکە خێرا چووینە قەراخ ئاوەکەوە. پێڵاو و گۆرەوییەکانمان هەڵگرت و تا توانیمان ڕامانکرد. شڤان لە پەلەپەلیدا دووبارە پیلاوەکەی باجی توبای لەسەر بەردەکە بیرچوو. ئێمە ڕاماندەکرد و بەستەزمانیش بە دواماندا دەینەڕاند.

دوایی بە ڕێگاوە بووین بۆماڵەوە. ئیتر لە هیچ شوێنێکیتر نەوەستاین، تەنها تۆزێک نەبێت. ئەوەش ئەوە بوو هەمووومان سەیری هیلانەی باڵندەمانکرد، کە شاد دۆزیبوویەوە بە دار توویەکەوە. یەک یەک چووینە سەر دارەکە و سەیری هێلانەکەمانکرد. چوار هێلکەی بچکۆلانەی شینی کاڵ لە هێلانەکەدا بوون.



من ئەو هێلکانەم دەناسییەوە چونکە شاد لەو جۆرە هێلکانەی زۆر بوو کە لە سەر ڕەفەی ژوورەکەی دانابوون.

کاتێک کە ئەم هەموو باسەم بۆ دایکم گێڕایەوە، دایکم سەری ڕاوەشاند و پێی وتم:

"ئێستا تێدەگەم بۆچی ئێوە هەموو ڕۆژێک لە کاتی خۆیدا ناگەڕێنەوە بۆماڵەوە."

شڤان چوو بۆ لای باجی توبا و پێی وتبوو، بەیانی پێڵاوەکانی بۆ دەهێنێتەوە. ئەو پێڵاوەکانی باجی توبای لەناو پاپۆڕێکی مەزندا داناوە. چەتەکانی دەریا پاسەوانی لێدەکەن. سەرکردەی چەتەکانیش کابرایەکی زۆر تووڕەیە ناوی بەستەزمانی پینەچییە. مەبەستی شڤانی برام لە پاپۆڕەکە ئەو بەردە بوو کە ئێمە لە سەری دانیشتبووین لە ناو میرگەکەی بەستەزمانی پینەچیدا.

# هەستیار دانێکی دەلەقێت



ڕۆژێکیان مامۆستاکەمان بە هەستیاری وت:
"هەستیار ئەوە چیتە، خۆ منداڵی ساوا نیت بۆچی پەنجە دەخەیتە ناو دەمتەوە!"
بە شەرمەوە هەستیار وەڵامی مامۆستای دایەوە:
"مامۆستا، ددانێکم دەلەقێت."
مامۆستاکەمان پێیوت:
"کە چویتەوەماڵەوە خۆت ددانەکەت هەڵبکێشە. بەیانی هەمووومان سەیری جێگەی ددانەکە دەکەین."
هەستیار دیاربوو زۆر لە ددانهەڵکێشان دەترسا. ئەگەر ددانەکە زۆر لەق نەبوایە، ئەو نەیدەویرا ددانی خۆی هەبڵکێشێت. با بۆتان باسبکەم منیش بۆ خۆم تۆزێک لە ددانکێشان دەترسام.
باوکم دەڵێت:
"کێشانی ددانی شیری ئازاری نییە."
لەوانەیە وەکو باوکم دەڵێت وابێت. هەڵکێشانی ددانی شیری ئازاری نەبێت، بەڵام بە هەرحاڵ ددانکێشان، ئەگەر ئازاریشی کەمبێت

هەر ناخۆشە. باوکمان پیشەی وابوو، هەر ددانێک باوکمان بیکێشایە ده فلس بەخشیشی دەداینێ. ئێمە ئەو ددانانەمان دەکێشا کە لەقبوون، بەڵام هەرچۆنێک بێت بەلامەوە ددانکێشان ترسی ئاسان نەبوو.

شادی برام هیچ ترسی نەبوو لە ددانکێشان. خۆی دەبوایە لە ڕاستیدا شاد ئەو دە فلسەی لە باوکم وەرنەگرتایە. چونکە ئەو خۆی ددانی خۆی هەڵدەکێشا. دەزوویەکی ئەستووری دەبەست بە دەوری ددانەکەیەوە و پەتەکەی ڕادەکێشا و ددانەکەشی دەهات بە پەتەکەوە. باوکم هەرچۆنیک بێت دە فلسەکەی دەدا بە شاد، ئەمەش لەبەر ئەوەبوو شاد ئازابوو. ئەو بێترس ددانی خۆی دەردەهێنا.

بەڵام هەستیاری قوربەسەر لە من زیاتر لە ددانکێشان دەترسا کاتێک کە لە قوتابخانە گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە، ئێمە هەموو دەستماندا لە ددانە لەقەکەی هەستیار و ددانەکەی بە تەواوەتی دەلەقی.

شاد وتی:

"وەرە با ددانەکەت بۆ دەربهینم. بەڵێنت دەدەمێ هەر هەست بە ئازاری هەڵکێشانی نەکەیت."

هەستیار بە بێدەنگی دەڕۆیشت و سەری دانەواندبوو.

منیش پێموت: "پێیناوێت دڵت زوویربێت لەبەرئەوەی ددانێکت لەقە، هەرچەندە خۆی وایە منیش ددانێکم لەق بوایە، لەوانەیە ئێستا وەکو تۆ خەفەتم هەبوایە."

شڤان وتی:

"هەستیار دەزانــی چیبکەیت باشــە. کاتێک گەیشتینە ماڵـەوە دەزوویەکی ئەستوور بپێچــە بە دەوری ددانەکـەتەوە و ســەری دەزووەکە دەبەستینەوە بــە شۆڕەبییەکەمانەوە. پارچــە ئاسنیکی سوورکراوە دەهێنم و نزیکــی دەمووچاوتی دەکەمەوە تۆش لە ترساندا سەرت بە خیرایی دەبەیت بۆ دواوە. بەو جۆرە ددانەکەت دەبێ بە دەزووەکەوە."

هەستیار بە تورەییەوە وەڵامی شڤانی دایەوە:

"ئاسنە سوورکراوەکە هەڵبگرە بۆ خۆت و ددانی خۆتی پێدەرکە."

کاتێک گەیشتینە ماڵەوە. هەستیار دەزوویەکی پێچا بە ددانەکەیەوە، بۆئەوەی جارجار دەزووەکە ڕاکبێشێت تا ددانەکە ئەوەندەیتر بلەقێت. هەستیار دەبوایە ددانەکەی دەربهێنایە. لەبەرئەوەی مامۆستاکەمان دەیویست ڕۆژی دوایی سەیری جێگەی ددانە هەڵکەندراوەکەی هەستیار بکات. من لـەو بڕوایەدا بووم، کــە تەنها ئەمە زۆرتر هەستیاری بێتاقەت کردبوو لە ئازاری ددانەکەی. ڕۆژی دوایی ئەو دەبوایە ددانەکەی بکێشایە، ئەگینا مامۆستا و قوتابییەکان بۆیان دەردەکەوت کە هەستیار ترسنۆکە و لە ددانهەڵیکێشان دەترسێت. هەستیار نەیدەویست خەڵکی پێیبزانن کە ئەو لە ددان هەڵکێشان دەترسێت.

هاوبەش ویستی دڵی هەستیار بداتەوە:

"ئەوەندە بە قورسی مەیگرە. لەوانەیە بەیانی مامۆستا بیری بچێتەوە."

بەڵام هاوبەش خۆی لە هەمووان باشتر دەیزانی کە مامۆستاکەمان هیچی لەبیرناچێتەوە. شڤان دەیوت ئەم مامۆستایەمان یادەوەری فیلی هەیە، هەرگیز هیچی لە بیرناچێت.

هەروەکو ئێوارەکانیتر ماوەیەک یاری فوتبۆڵێنمانکرد. دەزوویەکی ڕەشی ئەستور لە دەمی هەستیار هاتبووە دەرەوە. ئێمە پێکەنینمان دەهات کاتێک ئەو ڕایدەکرد و پەتەکە دەلەرییەوە. جاروباریش هەستیار بابەتی ددانی لە بیردەچووەوە، چونکە ئەو پێدەکەنی و پێکەنینەکەشی ئاسایی بوو. بەڵام کاتێک کە دەزووەکەی ڕادەکێشا دەموچاوی دەترشا و هەناسەیەکی قووڵی هەڵدەکێشا.

شڤان دوایی وتی:

"ئێستا کاتژمێر حەوتە. کەچی تا ئێستا جەنابت ددانەکەت دەرنەهێناوە. بەڕای من ئاسنە سوورکراوەکە لە هەموو شتێکیتر باشترە؟"

شادیش جارێکیتر سەیری ددانە لەقەکەی هەستیاریکرد پاشان وتی:

"ئەم ددانە بە ئاستەم بە پوکتەوە ماوە. دەزووەکە ڕابکێشە یەکسەر خۆی ددانەکەی پێوە دێت."

هەستیار ڕاچڵەکی کاتێک گوێی لە شاد بوو. خۆی ئەو تۆزە پوکەی کە دانەکەی ڕاگرتبوو بەلای هەستیارەوە زەحمەت بوو.

دوای ئەوەی کە بێتاقەت بووین لە یاریکردن، چووین بۆ سەردانی باپیرە، بۆمان گێڕایەوە کە هەستیار ددانێکی دەلەقێت. شڤان وتی: "دەبێت ئەمشەو هەستیار ددانی بکێشێت، چونکە مامۆستاکەمان وتویەتی بەیانی سەیری جێگەی ددانەکەی دەکات."

هەستیار دڵی پڕبوو، زۆری نەمابوو دەست بکات بە گریان. باپیرە پێی وتین:

"هۆهۆیایا.. هۆهۆیایا.، لە ددانهەڵکێشان. کاتێک کە منداڵ بووم."

هاوبەش چووە کۆشی باپیرە و پێیوت:

"توخودا باپیرە گیان، ئەو باسەمان بۆ بگێرەوە، کە بە منداڵی چۆن ددانیان بۆ کێشاوی."

باپیرە فەرمووی کاتێک کە ئەو منداڵ بووە. ددان ئێشەیەکی زۆری هەبووە. نزیکەی مانگێک بە ئازاری ددانەوە تلاوەتەوە. دواجار ناچار بووە بڕوات بۆ لای ئاسنگەر بۆ ئەوەی ددانەکەی بۆ دەربهێنێت. ئەو سەردەمە لە لادێکاندا دکتۆری ددان نەبووە. ئاسنگەرەکەش بە پلایسێک ددانێکی باپیرەی دەرهێناوە. کاتێک باپیرە هاتۆتەوە بۆ ماڵەوە، ددان ئێشەکەی هەر زۆرتر بووە. ئەمەش لەبەرئەوە بووە کە ئاسنگەرەکە بەهەڵە ددانێکی ساغی باپیرەی دەرهێناوە. باپیرە چەند ڕۆژێک بە ئازاری ددانییەوە تلاوەتەوە. بەڵام ئەو نەیوێراوە جارێکیتر بڕواتەوە بۆ لای ئاسنگەرەکە. لە کۆتاییدا ددان ئێشەکەی

ئەوەندە زۆری بۆ هێناوە کـە ئەو ناچـاربووە جاریکیتر بڕواتەوە بۆلای ئاسنگەرەکـە. ئەمجـارە ئاسنگەرەکـە بە زەحمەت ددانە ناساغەکەی باپیرەی دەرهێناوە، چونکە ددانی باپیرە ڕەگیکی ئەستوری هەبووە بە ئاسانی نەکێشراوە. هەستیار وتی:

"قوربەسەر باپیرە!"

من لەو بـڕوایەدام هەستیار ئەوەندەیتر لـە ددانکێشان دەترسـا. هەستیار وایدەزانی کـە ددانکێشانەکەی ئەویش بەلای کـەمەوە وەکو ددانکێشانەکەی باپیرە زەحمەت دەبێت، هەرچەندە ددانەکەی هەستیار زۆر لەقبوو، بە ئاستەم بە ڕەگەکەیەوە مابووەوە.

هاوبەش وتی:

"باپیرە، کاتێک منداڵ بویت دەترسایت لە ددان دەرهێنان؟"

باپیرە وتی:

"هۆهۆیایا، نایەتەوە یادم، ئەوکاتە حەفتا ساڵ پێش ئیستا بووە. من ئێستا سێ ددانم لە دەمداماوە ئەوانەش یەک لەدوای یەک دەکەون."

هاوبەش تۆزێک دڵخۆشی باپیرەی دایەوە:

"ئیتر تۆ پێویست ناکات هەرگیز لە ئازاری ددان بترست. وا نییە باپیرە."

"ڕاستدەکەیت هاوڕێ بچکۆلەکەم، ئیستا هەرگیز ترسم لە ئازاری ددان نییە."

باپیرە دوایی چـوو دۆلابەکەی کردەوە و حەلْوای بـۆ دەرهێناین.

هەریەکی حەڵوایەکمان وەرگرت و باپیرە بە زەردەخەنەوە پێی وتین:
"حەڵوا مەخۆن. بۆ ددانتان خراپە. هۆهۆیایا."
دوایی شەوشادمان لە باپیرە کرد و چووینەوە بەرەوماڵەوە. شڤان وتی:
"هەستیار باشە، بابەتی ددانەکەی تۆ چی لێبەسەر دێت، دەتەویت وازی لێبهێنیت، تا وەکو باپیرە پیر دەبیت؟"
هەستیار تووڕە بوو، ئەو هەقیشی بوو:
"ددان ددانی منە. ددانە لەقەکەی من چ ڕێگایەکی لەتۆ گرتووە."
هانا وتی:
"باشە ددان ددانی تۆیە، بەڵام کەی نیازت هەیە دەریبهێنیت."
هەستیار پەنجەی برد بۆ دەزووەکە و وتی:
"بەیانی زوو."
ئەمەی وت و ڕایکرد بەرەو ماڵەوە.
شڤان وتی:
"من بەزەییم بە هەستیاردا دێتەوە. ئەمشەو خۆم دەزانم چۆن یارمەتی دەدەم. هەر کە نووست ددانەکەی بۆ دەردەهێنم."
ئێمە هەموومان پێکەوە وتمان"
"نا..نا... نەخەڵەتابیت کاری وا بکەیت."
"بەڵێ.. بەڵێ... دکتۆر شڤان دەتوانێت ددان دەربهێنێت، بێ بەنج و هەقدەست وەرگرتن."

ئێمەش وتمان باشە لەگەڵتا دێین و سەیرت دەکەین. هەموومان چووینە ژوورەکەی شڤان و شاد و لەوێ چاوەڕێمانکرد.
خانووەکەمان زۆر لە یەکترییەوە نزیک درووستکرابوون. چەند مەترێک دووربوون لە یەکترییەوە. دارێکی شۆڕەبی گەورە لە نێوان ماڵی ئێمە و هەستیاردا هەبوو. شڤان و شاد و هەستیار بە شۆڕەبییەکەدا سەردەکەوتن کاتێک دەچوون بۆ سەردانی یەکتری. ژوورەکەی شڤان و شاد بەرامبەری ژوورەکەی هەستیار بوو. ژوورەکەی منیش بەرامبەری ژوورەکەی هانا و هاوبەش بوو.
لە ژوورەکەی هەستیارەوە ئێمە گوێمان لە تەقەتەقێک بوو لەوە دەچوو هەستیار بە شتێکەوە خەریک بێت. شڤان هاواریکرد:
"ئەرێ بەم زووانە ددانەکەت ناکێشیت؟"
هەستیار لە ژوورەکەیەوە هاواریکرد:
"ددان ددانی منە، تۆ هەقی ددانی منت نییە."
پاش ماوەیەک شاد هاواری لە هەستیارکرد:
"ئەرێ هەستیار خەوت نایەت؟"
"بەڵێ، خەوم دێ بەڵام چۆن خەوم لێبکەوێت، کاتێک دەقە نا دەقەیەک تۆ هاوارم لێدەکەیت."
شڤان قیژاندی:
"هەستیار! گڵۆپەکە بکوژێنەوە."

هەستیار هاواریکرد:
"گڵۆپەکەی خۆت بکوژێنەوە، هەقی گڵۆپی منت چییە."
شڤان گڵۆپی ژوورەکەی کوژاندەوە و ئێمەش بە تاریکی دانیشتبووین، چاوەڕێی ئەوەماندەکرد کەی هەستیار خەوی لێکەویت. دوای ماوەیەک هەستیار گڵۆپەکەی کوژاندەوە. هاوبەش بە باوێشکدانەوە وتی:
"خوایە زوو هەستیار خەوی لێبکەوێت، ئەگینا من پێش ئەو خەوم لێدەکەوێت."
زۆری پێنەچوو گوێمان لە خشەخشێک بوو. هەستیار بوو هات بۆ لای شڤان و شاد. من و هانا و هاوبەش خۆمان شاردەوە لە دۆلابی کورەکاندا. شڤان و شادیش خۆیان هەڵدایە سەر جێگەکەیان، لێفەکەیاندا بەسەرخۆیاندا. هەستیار سەری لە پەنجەرەکەوە هێنایە ژوورەوە و وتی:
"من نەخۆشم. بەیانی لە گەڵتاندا نایەم بۆ قوتابخانە."
شڤان وتی:
"ئینجا هەستیار تۆ کەی نەخۆشیت. وەڵاهی لە گوێزی ساغ ساغتریت."
شادیش وتی:
"ئازار لە لەشی مندا هەبێت لەهی تۆدا نییە."
"بە خودا سکم زۆر دێشێت."
هەستیار ئەمەی وتو گەڕایەوە بۆ ژوورەکەی خۆی.

من دڵنیابووم، ئەگەر هەستیار بە ڕاستی سک ئێشەی هەبوایە، ئەوە دوو بەشی لەبەرئەوەبوو کە ئەو لە ددانهەڵکێشان دەترسا.

ئەوەندە چاوەڕوانیمانکرد، خۆمان خەریکبوو خەومان لێدەکەوت. من ئەوەندە خەواڵوو بووم بە زەحمەت چاوم دەکردەوە. شڤان وتی:

"هەستیار دەبێت ئێستا نووستبێت."

هەمووومان یەک لە دوای یەک سەرکەوتینە سەر شۆڕەبییەکە و چووینە بەردەم پەنجەرەکەی هەستیار. شڤان لەسەرخۆ وتی:

"ئەرێ هەستیار بەخەبەریت."

"نا نوستووم."

هەستیار بە دەم خەوەوە، وەڵامی شڤانی دایەوە. هەمووومان لەسەرخۆ، بە بێدەنگی لە پەنجەرەکەوە چووینە ژوورەوە. شڤان گڵۆپە دەستییەکەی خۆی پێبوو، تیشکەکەی دەدا لە سەر جێگەکەی هەستیار. ئەو لەسەر جێگەکەی نوستبوو، دەزووەکەش لە دەمییەوە شۆڕببووە خوارەوە.

ئای خوایە من کە ترسام و لەپڕ هەستێکی ترسناکم لەلا درووستبوو. لەوە دەترسام ئەگەر هەستیار خەبەری بێتەتەوە و دەست بە هاواربکات، لەوانەیە لە ترساندا لانیکەم ببورێتەوە یان دڵی لەجێی خۆی بوەستیت.

شڤان دەستی باش گیرکرد لە دەزووەکە و وتی یەک دوو سێ.

هەر کە وتی "سێ" دەزووەکەی ڕاکێشا و ددانەکەی هەستیار هات بە دەزووەکەوە. هەستیار تۆزێک وڕێنەی کرد، لە هەمووی سەیرتر ئەوەبوو هەستیار خەبەری نەبووەوە. شاد ویستی هەستیار خەبەر بکاتەوە بەڵام هەستیار خەبەری نەبووەوە. شڤان وتی:

"بەیانی هەستیار کە خەبەری دەبێتەوە وا دەزانێت خێو ددانەکەی بۆ دەرهێناوە."

شڤان دەزووەکەی پێچا بە گڵۆپی بنمیچەکەوە ددانەکەی هەستیاریش جۆلانەی دەکرد بە دەزووەکەوە. ڕۆژی دوایی هەستیار نە ئازاری سک ئێشەی هەبوو نە ئازاری ددان. ئەو بە شڤانی وت:

"ئەم ددان دەرهێنانە. لە ژێر سەری تۆدایە."

ئێمەش بۆ هەستیارمان گێڕایەوە، کە هەموومان کاتی ددان کێشانەکەی لە ژوورەکەی ئەو بووین. هەستیار ئەوەندەیتر پێکەنی. کاتێک کە بە جوانی بۆمانگێڕایەوە کە هەستیار چی وتووە بە دەم خەوەوە. ئەو دڵخۆشبوو، لە خۆشیاندا هەڵدەپەڕی. هەستیار وتی:

"دەزانن کورینە لە ددانهەڵکێشان ئاسانتر نییە."

شڤان وەڵامی دایەوە:

"نەخێر.. نەخێر..، ددانکێشان ئازاری نییە کاتێک دکتۆر شڤان دەری بهێنێت."

"ئیتر لەو کاتەوە بڕیارماندا کە ددانی یەکتری بە شەو دەربهێنین، مەبەستم ئەو ددانانەیە کە دەلەقن.

کاتێک کـە چووینە قوتابخـانە، هەستیار یەکسەر چـوو بۆلای ماموٚستا و وتی:

"سەیربکە ماموٚستا، من ددانە لەقەکەی خوٚمم دەرهێناوە!"

"لە ڕاستیدا ماموٚستا من بوٚمکێشاوە."

شڤان ئـەم ورتەیەی لێوەهات، بەڵام بـڕواناکەم ماموٚستاکەمان گوێی لە شڤانی برام بووبێت.

# من و هاوبەش نازانین خەریکی چین

من و هاوبەش شوێنێکی تایبەتمان هەبوو. لە بەهاراندا گوڵی ڕەنگاوڕەنگی لێ سەوز دەبـوو. شوێنێکمان هەبـوو وەنەوشە و گوڵاڵە سوورەی تێدا سەوز دەبوو. شوێنێکی تریشمان هەبوو نێرگزی تێدا سەوز دەبوو. گوڵەزەردەش ئەوەندە زۆر بوو هەموو مێرگ و باخچە و گژو و گیای ئاواییەکەمانی داپۆشی بوو. ئێمە لە بەهاراندا گوڵاڵە سوورە و وەنەوشە و نێرگز و گوڵە زەردە دەکەینەوە. هەر کە چەپکە گوڵەکانمان نزیکی ڕووماندەکردەوە یەکسەر بۆمان دەردەکەوت کە بۆنی وەرزی بەهاریان لێوە دێت. بڕوام پێبکەن ئەگەر بەچاو نووقانیش بۆنمان بە گوڵەکانەوە بکردایە بۆمان دەردەکەوت کە بەهارە. من و هاوبەش لە بەهاراندا دەچووین بۆ شوێنێکی خۆش، شوێنەکە نزیکی کانییەکی بچکۆلانە بوو کە لە بەهاردا دەتەقی و لە هاویندا وشکی دەکرد.

ئێمە بۆ ئەوەی جلەکانمان تەڕ نەبێت، دوو سندوقی چامان لەناو کانییەکەدا دانابوو. لەسەر سندوقەکان دانیشتبووین، بە چواردەورماندا ئاو بە خوڕ دەڕۆیشت بەڵام ئێمە گیانمان تەڕ نەدەبوو. دەووروبەری کانیاوەکە پڕبوو لە داری چنار و شۆڕەبی و سنەوبەر. بۆنی گەڵاکانیان زۆر خۆشبوو، واماندەزانی لەناو سەوزە گیا و گەڵادا دانشتبووین.

خـۆر هەڵهاتبوو، داری میوە گوڵـی هەمە ڕەنگیان گـرتبوو. ئێمە زۆرجار دەچووین بۆ ئەوێ، چونکە خۆشترین شوێن بوو لە بەهاراندا. ڕۆژێکیان من و هاوبەش لەسەر سندوقی چاکە دانشتبوین. لەناو شەخەڵەکانەوە، هانا سەری دەرهێنا و ئێمەی بینی. هانا هاواری لێکردین:

"ئەوە خەریکی چین؟"

من و هاوبەش تۆزێک سەیری یەکترمانکرد و بیرمان کردەوە چی بڵێین. من وەڵامدایەوە:

"خۆشمان نازانین خەریکی چین."

من بە ڕاستی وەڵامدایەوە، چونکە من خۆم نەمدەزانی خەریکی چیم. هانا ڕۆیشت بە ڕێگەی خۆیەوە بەڵام لەبەر خۆیەوە لاسایی ئێمەی دەکردەوە:

"خۆشمان نازانین خەریکی چین!"

وەنەوشە لە دەوروبەری کانییەکە سەوز ببوو من و هاوبەش لە شوێنی خۆمان دانیشتبووین و خۆشمان نەماندەزانی بۆچی لەوێ دانیشتوین. لەپڕ من بەخەیاڵمدا هات و بە هاوبەشم وت:

"من کچە شازادەم و ناوم وەنەوشەیە."

هاوبەش وتی:

"منیش ناوم شازادە نێرگزە."

منیش بە دەنگێکی ناسک پێموت:
"بەخێرهاتی بۆ کۆشکە سەوزەکەم"
هاوبەشیش وەڵامیدامەوە:
"تۆش بەخێرهاتی بۆ کۆشکە سەوزەکەم."
من و هاوبەش ناکۆکبوین لەسەر ئەوەی کۆشکە سەوزەکە هی کاممـان بێت. ئەم ناکۆکییەمان چارەسەرکرد کـە هەردووکمان دوانەین. شازادە وەنەوشە و شازادە نێرگز هەر یەکەیان لە دیوێکی کۆشکە سەوزەکەدا دەژیان. هاوبەش بە دەنگێکی ناسک وتی:
"ئۆی.. کۆشکە سەوزەکەم. ئۆی.. ڕوبارە شێتەکەم."
منیش وتم:
"ئۆی.. کۆشکە سەوزەکەم. ئۆی.. ڕوبارە شێتەکەم."
ئەو ساڵە داری میوە هەمە جۆرەکان گوڵێکی ئێجگار زۆریان گرتبوو. من لقێکی دارسێوم کرد بە قژمەوە، هاوبەشیش لقێکی دارهەنار.
من وتم:
"ئۆی.. گوڵە سپییە جوانەکانم."
چاوەڕێمکرد هاوبەش دووبارەی بکاتەوە کەچی ئەو لە جیاتی، وتی:
"ئۆی.. کەروێشکە سپییەکانم."
منیش وتم:
"بەزیاد نەبێت کەروێشکی چی."

هاوبەش وەڵامی دامەوە:

"ئەو کەروێشکانەی کە لە کۆشکە سەوزەکەمدا لەناو قەفەزی ئاڵتوندان. ئەمانە کاتی خۆی دوو شازادەبوون بەڵام تەلیسمیان لێکراوە و ئێستا بوونەتە کەروێشک."

منیش وتم:

"نا.. نا..، شتی وا نییە."

لە هەمانکاتدا، لە قەراغی کانییەکەدا چاوم بە بۆقێکی سەوزی بچکۆلانە کەوت. منیش بە دەنگی بەرز وتم:

"ئۆی.. بۆقە بچکۆلانە جادو لێکراوەکەم."

دوایی بە پەلە ڕامکرد بە دوای بۆقەکەدا و زۆری نەبرد بۆقەکەم گرت.



دایک و باوکمان بۆیان گێڕابوینەوە کە لە سەردەمی کۆندا، هەندێک شازادە تەلیسمیان لێکراوە و بوون بە بۆق. بۆ ئەوەی تەلیسمەکە لەسەر شازادەکە لا ببرێت، دەبوایە کچێکی شازادە بۆقەکەی ماچ بکردایە. هاوبەشیش ئەم بەسەرهاتەی بیستبوو چونکە دایک و باوکی ئەویش هەمان بەسەرهاتیان بۆ ئەو گێڕابووەوە، بۆیە ئەو بە پاڕانەوەوە پێی وتم:

"سارا گیان، دەتوانم تۆزێک بۆقەکەت لێوەربگرم."

هاوبەش زۆر پاڕایەوە منیش دڵم نەرم بوو. بۆقەکەم دایە دەستی و لەهەمانکاتدا هاوبەش وتی:

"تۆ لەوبڕوایەدایت کە ئەم بۆقە لە ڕاستیدا شازادەیەکی جادولێکراوبێت."

منیش بە زەردەخەنەوە پێموت:

"شازادەی چی! بەخودا بۆنی خۆشی بەهار سەری لە تۆ تێکداوە."

من دەستمکرد بە بیرکردنەوە و لە دڵی خۆمدا وتم تۆ بڵێی هاوبەش ڕاستبکات. ئەم بۆقە لە ڕاستیدا شازادە بووبێت؟

لەوە دەچوو تیشکی خۆر و بۆنی خۆشی بەهار سەری لـە منیش تێکدابێت، بۆیە بیرم گۆڕی و وەکو هاوبەش لەو بڕوایەدابووم کە لەوانەیە بۆقەکە شازادەیەکی جادو لێکراو بێت.

منیش بە هاوبەشم وت:

"ڕاستدەکەیت، لەوانەیە خۆی بۆقەکە شازادە بووبێت جادوی لێکرابێت.

خودا ئێمەی بۆ ناردوە بۆ ئەوەی تەلیسمەکەی بۆ بەتاڵ بکەینەوە. ئـەم بۆقە قوڕبەسەرە هەر لەبەرئەوەی کچە شازادەیەک ماچی نەکردووە بۆیە ئەمڕۆ کەوتۆتە ناو ئەم دەوروبەرەوە."

کە هاوبەش گوێی لێمبوو، ئەویش هەمان بڕوای منی هەبوو. من بە هاوبەشم وت:

"با یارمەتی ئەم شازادە قوڕبەسەرە بدەین تاکو ببێتەوە بە شازادە. تەنها یەک شت ماوە بیکەین ئەویش هەردووکمان بۆقەکە ماچ بکەین و تەلیسمەکە بشکێنین."

هاوبەش وتی:

"بڕۆ لاچۆ، من چۆن بۆق ماچدەکەم."

"بڕواناکـەم کچە شـازادەکانی سـەردەمی کۆن وەکو تـۆ خۆیان خۆشویستبێت. ئەگەر ئەوان وەکو تۆ بوونایە ئەوا سەرانسەری ئەم دنیایە پڕدەبوو لە شازادەی تەلیسملێکراو."

هاوبەش وەڵامی دامەوە: "باشە سارا گیان! خۆ ئێمە کچە شازادەی ڕاستەقینەنین."

منیش وتم: "ڕاستدەکەیت، من دەزانم ئێمە کچە شازادەنین، بەڵام هەر چۆنێک بێت، ئەرکـی سەرشانمانە ئـەم شازادە قوڕبەسەرە ڕزگاربکەین. ئەگەر هەردوکمان ماچی بۆقەکە بکەین بە دڵنیایی شازادە تەلیسم لێکراوەکە ڕزگاری دەبێت."

هاوبەش شازادە جادولێکراوەکەی دایە دەستم و وتی:
"شازادە وەنەوشە، فەرمووە بۆقەکە ماچبکە."
منیش بۆقەکەم گرت بە دەستەوە، تاوێک لێی وردبوومەوە. کاتێک کە بیرم لەوە دەکردەوە کە دەبێت ماچی شازادە تەلیسملێکراوەکە بکەم، دڵم تێکەڵدەهات. لە پڕ بیرم لە شتێکی دیکە کردەوە و بە هاوبەشم وت:
"هاوبەش، ئەگەر ئەو بۆقە لە ڕاستیدا شازادەبێت. ئەوە نابێ ئەوەت لەبیربچێت کە دەزگیرانی خۆمە. هاوبەش بە سەر سوڕمانەوە وەڵامیدامەوە: "مەبەستت چییە؟"
"بەڵێ، شازادەکە لەوانەیە کوڕی پادشا بێت و خاوەنی ولاتێکیش بێت. ئەو کاتە شازادەکە بۆ من دەبێت.
هاوبەش بە توڕەییەوە وتی:
"ئەگەر منیش ماچی نەکەم ئەوا تەلیسمەکە لەسەر شازادەکە لاناچێت. شازادەکە چەند هی تۆیە ئەوەندەش هی منە، هەروەها نیوەی سامانەکەشی."
پاشان ڕێککەوتین لەسەر ئەوەی کە شازادەکە دوایی خۆی یەکێکمان هەڵبژێرێت. ئەو کەیفی خۆیەتی شازادە وەنەوشە یاخود شازادە نێرگز هەڵبژێرێت.
منیش وتم: "یەک دوو، سێ."

کە سێهەمم ژمارد چـاوم نوقاند و بۆقەکەم ماچـکرد. بەڵام لـە هەمـووی سەیرتر ئـەوە بوو بۆقە تەلیسملێکراوەکـە هیچ گۆڕانی بەسەر نەهات. هاوبەش وتی:

"من بزانم ئـەم شازادەیە تەلیسمێکی ئەوەندە قورسـی لێکراوە. بڕواناکەم هیچ کەڵکێکی هەبێت ئەگەر بێت و منیش ماچی بکەم. من لەو بڕوایەدانیم تەلیسمەکەی لەسەر لاببرێت."

منیش وتم:

"شتی وانییە، فەرموو شازادە نێرگز، بە خۆشی بێت یان بە ترشی دەبێت ماچی بۆقەکە بکەیت."

هاوبەش بۆقەکەی لە دەست وەرگرتم و خێرا ماچی کرد. ماچکردنەکەی زۆر بە پەلە بوو. بۆ نەگبەنی لە پەلەپەلیدا بۆقەکەی لە دەست بەربووە خوارەوە، ئەویش بە بازدان ونبوو لەبەر چاومان. منیش بە زەردەخەنەوە هاوارمکرد:

"ئەرێوەڵا، ئا لێرانەدا، نیو وڵات و نیو شازادەم لەکیس چوو."

هاوبەش وتی:

"بەقسەت نەکـردم. من پێم نـەوتیت دەبێت کچـە شازادەی ڕاستەقینە بۆقەکەی ماچبکردایە."

لەپڕ لـە پشتی شەخەڵەکانەوە گوێمان لـە قاقای پێکەنین بوو. شڤان و شاد و هەستیار و هانا خۆیان مەڵاس دابوو گوێیان لـە

هەموو قسەکانمان بوو. هانا وتی:
"سەیربکەن، ئا لەوێدا ئەو کەسانەی لێیە کە نازانن خەریکی چین."
شڤان بە گاڵتەوە وتی:
"ئۆی.. کۆشکە سەوزەکەم"
"ئۆی.. ڕوبارە شێتەکەم!"
شاد وتی:
"ئۆی.. ئۆی... گوڵە سپییە بۆن خۆشەکان.
ئۆی.. ئۆی... کەروێشکە سپییە جادولێکراوەکان.!"
هەستیار ئەوەندە پێکەنی خەریکبوو دەکەوت بە پشتدا:
"ئەگەر بۆق شازادە بێت... هەزار کەلاوە بە پولێک دەبێت."
هاوبەشیش لە داخاندا قوتووە بەتاڵەکەی پڕکرد لە ئاو و کردی بە دەمووچاوی هەستیاردا. هەستیار هاواریکرد:
"شێت بووی شازادە نیرگز ! بۆ وا دەکەیت؟."
هاوبەش وەڵامیدایەوە:
"من کاتێک تووڕە دەبم، نازانم چیدەکەم."
منیش دەستم خستە ناو ئاوەکەوە مشتێ ئاوم کرد بە دەموچاوی شڤانی برامدا و پێموت:
"من و هاوبەش کاتێک تووڕە دەبین خۆشمان نازانین چی دەکەین."

# پیاوە داناکان

ئەو ددانەی کە شڤان بۆ هەستیاری دەرهێنابوو، لای هەستیار لە گەوهەر بە نرختربوو. هەستیار ددانەکەی لە قاوغە شقارتەیەکدا دانابوو. قاوغە شقارتەکەی خستبووە گیرفانییەوە. زۆرجار قاوغە شقارتەکەی دەردەهێنا و تاوێک سەیریدەکرد.

زۆری نەبرد ددانێکی شادیش کەوتە لەقین. بۆ ئەو هیچ هونەر نەبوو هەڵکیشانی ددان. شاد ئازابوو. ئەو یەکسەر بڕیاریدا کە لەکاتی نوستندا ددانەکەی دەربهێنێت. شاد دەزوویەکی ئەستووری درێژی پێچا لـە ددانە لەقەکەیەوە. پێش ئەوەی بچێتە جێگەی نووستنەکـەیەوە، دەزووەکـەی بەستبوو بـە دەسکـی دەرگـای ژوورەکـەیەوە. سـەر لەبەیانی ڕۆژی دوایـی باجی توبا هاتبـوو کوڕەکان خەبەربکـاتەوە. کاتێک باجی توبا دەرگاکەی کردۆتەوە دەزوەکەی ڕاکێشاوە، بەوجۆرە ددانەکەی شاد هاتووە بە دەزووەکەوە. لـە هەمووی سەیرتر ئەوەبوو کـە شاد خەبەری بووەتەوە پێش ئەوەی باجی توبا پێ بخاتە ناو ژوورەکەیەوە.

شتێکی زۆر سەیر و سەمەرەیە کە منداڵ ددانکەوتنی بەلاوە زۆر گرنگە. ڕۆژی دوایی شاد کە چوو بۆ قوتابخانە، ددانەکەی لە قاوغە شقارتەیەکدا دانابوو. شاد و هەستیار ددانەکانیان لەگەڵ یەکتریدا

بەراورد دەکرد. ئەمەش بوو بە هۆی ئەوەی شڤان ئیرەیی بەوان بەرێت، چونکە ئەو ددانی کەوتووی نەبوو. بەڵام ئەو وتی:

"بیرم چۆتەوە ددانە کەوتووەکەی ساڵی ڕابوردووم لە کوێ داناوە. ئەو ددانەم کە پار دەرمهێنابوو. ئەو ساڵەی کـە دکتۆری ددان بۆ یەکەمین جار هات بۆ گەورەدێ."

شڤان زۆر گەڕا بە شوێن ددانە کەوتووەکەیدا، کەچی ئەو کۆمەڵێک شتیتری دۆزییەوە. کـە ئەو هەر لـە بیری چووبوونەوە. لە قاوخە شقارتەیەکدا چەند قاوغە فیشەکـی تفەنگ، فیقەیەکـی شکاو، پێنج سەربازی قورقوشـمی شکاو، کاتژمێرێکـی شکاو، گلۆپێکی دەستی شکاو، هەروەها ددانە کەوتووەکەشی کە ئەویش شکاوبوو. هەر لەبەرئەوەی ددانەکەی شڤان شکاوبوو، بۆیە دکتۆری ددان بۆیدەرهێنابوو. شڤان سەیری هەموو شتە شکاوەکانی کرد و وتی:

"شـەرتە ڕۆژێک بێت هەمووتان چـاک بکەمەوە، بەڵـێ هەر هەمووتان، بێجگە لە ددانە شکاوەکەم."

شڤان ددانە شکاوەکەی خستە ناو قاوغە شقارتەیەکەوە. سەر لە ئێوارە شڤان و شاد و هەستیار دەهاتن و دەچوون و خرەخری قاوغە شقارتەکەی ناو دەستیان دەهات. کوڕەکان ئەوەندە لوت بەرزبوون کە نەیاندەویست وەکو جاران یاریمان لەگەڵدا بکەن. من و هانا و هاوبەش خەریکی خەتخەتێنی خۆمان بووین و گوێمان بەوان نەدەدا.

هانا وتی: "ئەوەندە بێزاربووم لە باسی ددان. دەڵێی چەند ددانم لە دەممدا هەیە هەموویان پێکەوە دەربهێنم."

کوڕەکان ماوەیەکی زۆر لە ژوورەکەی شڤان و شاد مانەوە. ئا لەوکاتەی کە ئەوان هاتنە دەرەوە. ئێمە بە جوانی لە دەموچاویاندا دەمانبینی کە فێڵێکیان لە ژێرسەردایە.

شڤان بە هەستیار و شادی وت: "نابێت هیچ بۆ کچەکان بگێڕنەوە. نابێت ئەوان بزانن ئێمە چیدەکەین."

شاد وتی: "نەخێر و نەخێر، وا باشە ئێمە بۆیان نەگێڕینەوە."

هەستیار وتی: "هەرگیز شتی وا ناکەین."

ئێمەش خەریکبوو شەقمان دەبرد بۆ ئەوەی بزانین ئەوان خەریکی چین. بەڵام من و هانا و هاوبەش خۆڕاگر بووین و خۆمان واپیشاندەدا کە نهێنییەکەیان بەلامانەوە گرنگ نییە. من وتم: "ئێستا نۆبەی تۆیە هاوبەش."

ئێمە خەتخەتێنمان دەکرد و وامان پیشاندەدا کە گوێ بەوان نادەین. شڤان و شاد و هەستیار دانشتبوون لە قەراغی جادەکە و سەیریان دەکردین. شاد بە شڤانی وت:

"تۆ دڵنیایت لە شوێنێکی باشدا شاردوتەتەوە."

"خەمت نەبێت لە شوێنێکی وادا شاردومەتەوە کەس نییە بتوانێت بیدۆزیتەوە."

هەستیار وتی:
"بەڵێ، ئەگینا کچەکان دەیدۆزنەوە، ئەو کاتە ئێمەش ڕیسەکەمان دەبێتەوە بە خوری."
شڤانیش سەرێکی بۆ لەقاند وەکو ئەوەی بڵێت تۆ ڕاستدەکەیت.
هانا بە منی وت: "سارا! نۆبەی تۆیە؟"
ئێمە خەتخەتێنی خۆمان دەکرد، وا خۆمان پیشاندەدا کە گوێمان لە دەنگی پیاوە داناکان نییە. کوڕەکان ڕۆیشتن، هاوبەش ئیشارەتێکی بۆ کردین و چپاندی بە گوێماندا:
"هەها! ئا لەوێدا پیاوە داناکانی ئاواییەکەمان پێکەوە دەڕۆن"
هەمووومان دامانە قاقای پێکەنین.
شڤان لایەکی کردەوە و وتی:
"چـەند خۆشە ئێوە دڵشاد دیارن. چـەند خۆشە کەشتی گرنگ لە ئارادایە و ئێوە لێی بێئاگـان. لەبەر ئەم هۆیەیە بەزەییم پێتانـدا دێتەوە."
ئەو کاتە بڕیارماندا بزانین کوڕەکان چییان بە دەستەوەیە. ئاخۆ ئەوە چی بێت ئەوان ئەوەندە خۆیانی پێوە هەڵدەکێشن. هەرچەندە ئێمە لەو بڕوایەدابووین کە ئەمە شتێکیتری هیچوپووچی دروستکراوی کوڕەکانە. بەڵام ئێمە هەر سووربووین لە سەر ئەوەی کە نهێنییەکەیان ئاشکرا بکەین.

کوڕەکان چوون بۆ مێرگەکەکەمان و لەوێ سواری ئەسپەڕەش بوون، ئەسپەکەی ماڵی خۆمان. ئێمەش چوینە ژوورەکەی شڤان و شاد. دەگەڕاین و دەگەڕاین. بەڵام دۆزینەوەی شتێک ئاسان نەبوو کە خۆمان نەماندەزانی چییە و ڕەنگی چۆنە. لە هەمانکاتدا ئێمە هەر دەگەڕاین و کۆڵمان نەدەدا. سەیری هەموو شوێنێکمانکرد، چەکمەجەکان، ژێر قەرەوێڵەکە، ڕەفەکان، زۆپای خشتی کاشییەکە، هەمـوو شوێنێک گەڕاین، هەتـا هەورەبانەکەش گەڕاین بەڵام هەوڵدانەکەمان بێ سوود بوو .

کاتێک کە ئێمە لـە گەرمەی گەڕاندا بووین لـە هەورەبانەکەدا، گوێمان لە تەپەتەپ بوو، کوڕەکان بوون لە قادرمەکانەوە دەهاتنە سەرەوە. وەی خودایە گیان کە پەلەمان بوو زوو خۆمان بشارینەوە. لە هەورەبانەکە جلی زۆری لێهەڵواسرا بوو. چووینە ناو جلەکانەوە تەواو بێدەنگبوین. شاد بە شڤانی وت:

"با بیهێنینە دەرەوە و جارێکیتریش سەیری بکەین."

شڤان وتی:

"پێش هەموو شتێک دەبێت بزانین کچەکان لە کوێن."

"ئەوان لەوانەیە لە ژوورەکەی هانا بن."

"ئەگەر ئەوان لەم نزیکانە بونایە ئێستا گوێمان لە حیلکە حیلکیان دەبوو."

هەستیار وتی:
"لەوانەیە ئەوان ئێستا لە ماڵی هانا و هاوبەش بن. ترست نەبێت بیهێنە دەرەوە با ببینین."
ئێمەش وەک بـت وەستابوین نەماندەوێرا بجـوڵێینەوە. من زۆر دەترسام لەوەی کە بپژمم، یاخود پێبکەنم. لەوە دەچوو کە شڤان ڕێک بەرەو ڕووی من بێت، منیش خەریک بوو لە جێگەی خۆمدا گیانم دەردەچوو. بەڵام ئەو لەپڕ چەمییەوە و شتێکی هەڵگرت. من بە تەواوەتی نەمبینی و نەمزانی چییە. هاوبەش پاڵێکی بە منەوە ناو منیش پاڵێکم بەوەوە نایەوە. شڤان وتی:
"ئەی پیاأوە داناکان بە یەک دەنگ، سـوێند بخۆن. کـە هەرگیز نهێنییەکەمان بۆ کەس ئاشکرا نەکەین."
شاد وتی: "بەڵێ باشە، بەڵام چۆن سوێند بخوێن."
شاد هەمووشتێکی بەلاوە زەحمەت بوو، وەکو شڤان نەبوو. ئەو نەیدەتوانی وەکو شڤان و هەستیار شت هەڵبەستێت. شاد وتی:
"ئێمە سوێند دەخوێن کە شوێنی شاردنەوەکە بۆ کەس ئاشکرا نەکەین."
شڤان وتی: "سوێند بخۆن کە هەرگیز لای ئەوانیتر، پەردە لە سەر ئەم نهێنییەمان لا نەدەن."
ئەوانیش سوێندیان خوارد. خۆی ئەوانیتر مەبەستیان من و هانا و هاوبەش بوو، من جارێکی تر پاڵێکمنا بە هاوبەشەوە.

شاد و هەستیار سوێندیان خوارد کە هەرگیز ڕێگا نەدەن ئەوانیتر توخنی شوێنی نهێنییەکە بکەون. شڤان پێی وتن:

"ئەگەر بێت و ئەوانیتر پەردە لە سەر نهێنییەکەمان لادەن ئـەوا هەرچی هێز و تواناماں هەیە هەمووی بە فیرۆ دەچێت."

ئۆی..، کەمن حەزمدەکرد ئەو شتانە ببینم، بەڵام کوڕەکان بەردەمیان گرتبووم. لە کوتایدا شڤان شتەکەی لە شوێنی خۆی دانایەوە.

شوێنە نهێنییەکە ژێر تەختە لەقەکە بوو. دواییش یەک بەدوای یەکدا بە پێپلیکانەکاندا چوونە خوارەوە.

ئێمەش ئاڵۆش کەوتە ناوگیانمانەوە، هەر کە گوێمان لە دەرگای هەورەبانەکە بوو درا بەیەکدا، بە پەلە تەختە لەقەکەمان لاداو لە ژێر تەختەکەدا قاوغە شقارتەیەکی بەتاڵمان دۆزییەوە. من ناسیمەوە، دڵنیابووم کە قاوغە شقارتەکەی شڤانی برام بوو. بە پیتی گەورە لە سەری نوسرابوو کەسە داناکان. هەروەها وێنەی کەللەسەرێکی مردووی تێدا کێشرابوو.

هانا وتی: " دڵم شەقی برد، خێراکە بیکەرەوە."

منیش هەتا توانیم سەرم بردە پیشەوە بۆ ئەوەی بە جوانی بیبینم. چیمان بینیبێت باشە؟! سێ ددانی بچکۆلانەی سپی، دوو ددانی ساغ و دانەیەکی شکاو. لە پاکەتی پیاوە داناکاندا هەر ئەو سێ ددانەی تێدا بوو. هانا سەری ڕاوەشاند و بە زەردەخەنەوە وتی:

"زۆرجار بە خەیاڵمدا دێت، ئەم کوڕانە نەک تەختەیەک بەڵکو هەزار تەختەیان نووقسان بێت."

باجی توبا، ئیشکەرەکەمان، ئەشیاکانی لە دۆلابێکی کۆندا دانابوو. دایکم پێی وتبوین نابێت بە هیچ جۆرێک نزیکی ئەو دۆلابە بکەوین. بەلام باجی توبا زۆر دڵ نەرم و میهرەبان بوو. ئەو هەمیشە شتە جوانەکانی خۆی پێنیشان دەداین. کراسی بوکێنی خۆی، کۆمەڵێک کارتی جوان کە گوڵیان تێدابوو، شو شەیەکی بۆن کە بۆنەکەی زۆر خۆشبوو. بازنێک کە ئاڵتوونی تەواو نەبوو، تویژاڵێک ئاڵتوونی بەسەرەوە بوو، هەندێک شتیتریش خۆ من ئێستا هەموویانم نایەتەوە یاد.

ساڵی پێشوو کاتێک دکتۆری ددان هات بۆ گەورەدێ. تاقمیک ددانی تازەی بۆ باجی توبا درووستکرد. دکتۆرەکە وتبووی لە ژیانیدا تاقمی ددانی ناشیرینی وەکو تاقمە کۆنەکەی باجی توبای نەبینیوە. ئـەو بەستەزمانە خۆی جوان بـوو، بەلام تاقمە ددانەکەی زۆر ناشیرین بوو. باجی توبا تاقمە کۆنەکەی فڕێنەدا. ئەو بەمنی وت جاروبار لە ڕۆژانی ئاساییدا ئەو تاقمە لە دەم دەکات. بە تایبەت ئەو ڕۆژانەی کە ئاووهەوا ناخۆشە. تاقمە تازەکەش هەڵدەگرێت بۆ ڕۆژانی هەینی یان کاتی ئاهەنگ.

باجی توبا دەیوت:

"تاقمە کۆنەکەم سەرو زیادە بۆ شیر دۆشین و ئالیک بە مانگادان."

بەڵام ئەو پاش ماوەیەک تاقەتی چوو لە تاقمە کۆنەکەی. چونکە تاقمە تازەکەی جوان لێدەهات. باجی توبا حەزی لە کاک زۆراب بوو، بۆیە ئەو لە ڕۆژە ئاساییەکانیشدا دەیویست خۆی جوان بکات. تاقمە کۆنەکەی باجی توبا لە چەکمەجەکەی سەرەوەی دۆلابەکەدابوو، خۆم دەمزانی لەوێدایە. هەر کە بینیم یەکسەر بیرێکی چاکم بۆهات کە بۆ هانا و هاوبەشم گێڕایەوە.

"کچینە دەزانن چیدەکەین. تاقمە کۆنەکەی باجی توبا دەخەینە ناو پاکەتەکەوە. ئەگەر بێتو کوڕەکان وەکو خۆیان دەڵێن هێزێکی نهێنی گەورە لە دوو ددانی ساغ و ددانێکی شکاو وەربگرن، ئاخۆ چ هیزێکی گەورە لە تاقمە کۆنەکەی باجی توبا وەردەگرن؟"

هانا و هاوبەش پێشنیارەکەی منیان زۆر بە دڵبوو.

هانا وتی:

"دەمخۆش سارا گیان. ئەمە زۆر باشترە لەوەی کە ئێمە ددانەکانیان فڕێبدەین. ئەگەر کوڕان خەریکی ئەم شتە قۆڕانە بن با پیشانیان بدەین کە ئێمە بایەخ بە بابەتەکانیان نادەین."

بەو شێوەیە تاقمی ددانەکەی باجی توبامان خستە ناو پاکەتی جگەرەکە و خستمانەوە شوێنی خۆی. دوایی چوینە دەرەوە بۆ ئەوەی بزانین کوڕەکان لە کوێن. ئەوان خەریکی هەڵماتێن بوون. ئێمەش لە قەراغی جادەکە دانیشتین سەیرماندەکردن. هانا پێی وتن:

"ئەرێ پیاوە داناکان خەریکی چین، بەم ئێوارە وەختە خەریکی هەڵماتێنن!"

کوڕەکان وەڵامیان نەدایەوە. شڤان دەستی پڕبوو لە هەڵمات و منیش وتم: "ئەوە بۆ شوێنی نهێنییەکەتان، پڕ ناکەن لە هەڵمات."

شڤان هەناسەیەکی قووڵـی هەڵکێشا. ئـەوەی ڕادەگەیاند کـە ئەوانیتر گەمژەن و لە هیچ تێناگەن. هاوبەش پاڵێکی بە شڤانەوە ناو وتی: "ئەرێ ئێوە باسێکی پیاوە داناکان بۆ ناکەن."

بەڵام شڤان پێی وتین ئەوە شتێکی ئەوەندە سووک نییە کە بۆ کچانی بگێڕینەوە. نهێنییەکەیان پڕە لەهێزی گەورە و خولقێنەر، کە دەتوانرێت موعجیزەی سەیری پێبهێنرێتەدی. لە شوێنێکیدا نهێنییەکەمان حەشارداوە، کە خۆشمان نازانین لە کوێدایە، تەنها ئـەو برا نهێنیانە دەزانن، کـە کاری پاراسـتنی نهێنییەکەیـان پێسپێردراوە. ئەگینا هێزە نهێنییەکانمان لـە کیسدەچن. هانا بـە فێڵبازییەوە پێی وتن:

"ئەرێ ئەو برادەرە نهێنیانە، شڤان و شاد و هەستیار نین."

شڤان حەپەسـا و تۆزێک بێـدەنگبوو. مـن و هانا و هاوبەش هەرسێکمان پێکەوە دەستمانکرد بە قاقای پێکەنین. شاد وتی:

"من لەو بڕوایەدام، ئێوە بۆیە پێدەکەنن بۆ ئەوەی تووڕەمانبکەن، چونکە نازانن، چیمان لە قاوغە شقارتەکەدا شاردۆتەوە.

هانا بە زەردەخەنەوە وتی:
"بێگومان ئێوە پاکەتەکەتان لە دۆلابەکەتاندا شاردۆتەوە."
شاد پێدەکەنی و دەیوت:
"ئا.. ئا... لەوێ شاردومانەتەوە، بڕوا بکەن لەوێدایە."
هاوبەش وتی:
"لەوانەیە لە ژێر تەختە لەقەکەی هەورەبانەکەدا شاردبێتتانەوە."
شڤان و شاد و هەستیار هەرسێکیان بەنج بوون لە جێگەی خۆیاندا.
پاش ماوەیەک هەرسێکیان پێکەوە وتیان:
"ئا.. ئا... لەوێدا شاردومانەتەوە."
ئەوان بە ناوهێنانی تەختە لەقەکە زۆر تێکچوون. یەکسەر وازیان لە هەڵماتێن هێنا. شڤان بە شادی وت:
"وەرە با بچینە سەرەوە و تۆزێک سەیری هێلکەی باڵندەکانت بکەین."
ئەوان وایاندەزانی ئێمە بڕوایان پێدەکەین کە ئەوان دەیانەوێت بچن بۆ سەیرکردنی هێلکەی باڵندە. ئێمە لەو سەرەوە هاتبوینەوە و تێگەیشتبووین کـە ئەوان دەیانویست بچن بزانـن پاکەتەکە لە شوێنە نهێنییەکەی ماوە یان نا. شاد بەلایەوە سەیر بوو بۆیە بە حەپەساوی بە شڤانی وت:
"سەیری هێلکەی باڵندەی چی؟ تۆ هەزار جار هێلکەی باڵندەکانت بینیووە."

شاد خۆی وابوو، درەنگ لـە شت تێدەگەیشت. بەڵام شڤان بە توورەییەوە سەیریکرد و ئیشارەتێکی بۆ کرد. ئینجا شاد تێگەیشت بابەتەکە چییە.

شاد وتی: "باشە! با بڕۆین سەیری هێلکەی باڵندەکان بکەین."

کوڕەکان چوون بەڕێی خۆیانەوە. ئەوان لەسەرخۆ دەڕۆیشتن بۆ ئەوەی ئێمە گومانیان لێنەکەین. ئێمە پەلەمانبوو خۆمان دەمانزانی ئەوان بۆ کوێ دەڕۆن. بە ڕاکردن چووین بۆ ماڵی هەستیار و بە دایکیمان وت دەمانەوێت کتێبێک لە ژوورەکەی هەستیار بهێنین. بە ڕاکـردن بە پێپلیکانەکانـدا چووینە ژوورەکـەی هەستیار. لە پەنجەرەی ژوورەکەیەوە چووینە سەر شۆڕەبییەکە و لەوێوە خێرا گەڕاینەوە بـۆ ژوورەکەی شڤان و شاد. لەوێشەوە چووین بـۆ هەورەبانەکە و لەناو جلەکاندا خۆمان شاردەوە. ئێمە چاوەڕوان بووین چونکە دەمانزانی کە کوڕەکان هاکا هاتن بۆ هەورە بانەکە. زۆری نەبـرد گوێمان لـە تەپەی پێی کـوڕەکان بوو کـە بە پێپلیکانەکاندا سەردەکەوتن بۆ هەورە بانەکە.

شاد وتی: "تۆ بڵێی کچەکان بە شوێنەکەیان زانیبێت؟ هاوبەش مەبەستی چی بوو کە وتی: "لەژێر تەختە لەقەکەی هەورەبانەکەدایە" یەکسەر شڤان وەڵامی شادی دایەوە:

"کورە هانا هەر لە خۆیەوە ئەو قسەی کرد، بەڵام چاکتروایە بۆ

دڵنیایی جێگەی نهێنییەکەمان بگوێزینەوە بۆ شوێنێکیتر."
شڤان تەختەکەی لابرد، بەڵام ئێمە هیچمان نەدەبینی چونکە کوڕەکان بەرچاویان گرتبوین. هەستیار و شاد وتیان:
"دەمانەوێت ددانەکانی خۆمان ببینین."
شڤان وتی: "ئەی پیاوە داناکانی دێ بچکۆل دەبێت نهێنییەکەمان بپارێزین و نەهێڵین ئەوانیتر ببینن."
تۆزێک بێدەنگبوون. ئێمەش تێگەیشتین کە شڤان سەری پاکەتەکەی هەڵداوەتەوە و تاقمەکەی باجی توبای تێدا بینیوە. هەرسێکمان پێکەوە قیژاندمان و دامانە قاقای پێکەنین. دوایی بە تەشەرەوە بە کوڕەکانم وت:
"کوڕینە ئێستا ئێوە لە تاقمی ددانەکەی باجی توبا، هێزێکی نهێنی وا وەردەگرن، کە لە جیهاندا وێنەی نییە."
هاوبەش وتی: "توو سەری خۆت شڤان گیان. هەندێک موعجیزەمان بۆ بنوێنە."
شڤان تاقمەکەی باجی توبای فڕێدا و بە تووڕەییەوە وتی:
"خوزگە خوا کچی دروستنەکردایە. چونکە ئەوان هەرچی خۆشی بێت لە پیاوی تێکدەدەن."

# شڤان ڕەشەولاخی سەردەمی کۆن ماڵیدەکات

من تەنها بە دووشت، ئیرەیی بە هانا و هاوبەش دەبەم. یەکەمیان ئەوان باپیرەیان هەیە و من نیمە. هەرچەندە خۆی باپیرە دەڵێت ئێمە چەند منداڵێکی کەمین لە دێ بچکۆل، ئەو حەزدەکات ببێت بە بابیری هەمووومان. بەڵام هاوبەش دەڵێت: "لەوانەیە وا بێت، بەڵام ئەو تەواو.. تەواو.. تەواو... باپیرەی من و هانایە."

کاتێکیش کە سەردەدەین لە باپیرە و ڕۆژنامەی بۆ دەخوێنینەوە، هەموو جارێک هاوبەش لەسەر کۆشی باپیرە دادەنیشێت و ئەویش پێی دەڵێت: "هاوڕێ بچکۆلانەکەم."

من تێناگەم بۆچی باپیرە ئەو جیاوازییە دەکات لە نێوانماندا. خۆ ئەو چاوی باش نابینێت، ئیتر چۆن ئەو جیاوازییەمان لەگەڵدا دەکات. هانا و هاوبەش خۆ تووکیان نییە وەکو ئەو کچەی کە لە بەسەرهاتی ئینجیلدا باسکراوە، هیچ هونەر نەبوو بۆ باوکە کوێرەکە، کە کچەکانی لە یەکتر جیابکاتەوە، چونکە یەکێک لە کچەکان تووکی پێوەبوو ئەویتریان تووکی پێوە نەبوو.

بە هەرحاڵ قەیدی نییە، با باپیرە ئەم جیاوازییەمان لەگەڵدا بکات، چونکە ئەو پیاوێکی دڵنەرم و میهرەبانە، من زۆرم خۆش دەوێت.

ئەو زۆر دڵگەورە و بەستەزمانە. لە ڕاستیدا ئەوەندە گرنگ نییە، با ئەو بانگی هانا و هاوبەش بکات بە "هاوڕێ بچکۆلانەکەم".

دووهەمین شتیش کە من بەهۆیەوە ئیرەیم بە هانا و هاوبەش دەبرد، ئەوە بوو ئەوان خاوەنی چەمی خۆیان بوون، کە بە تەنها هەر هی خۆیان بوو. هەر تۆزێک بەناو لەوەڕگا پەرژینکراوەکەیاندا دەڕۆیشتین دەگەیشتینە چەمەکەیان. بە هاویناندا لەوێ خەریکی مەلە کردن بووین.

جارێکیان من و هاوبەش تێکچووین. ئەو پێی وتم کە ئیتر بۆم نییە لـە چەمەکەی ئەواندا مەلە بکەم. بەڵام دایکـی هاوبەش بۆی باسکردم کە من بۆم هەیە بە ویستی خۆم لە چەمەکەیاندا مەلە بکەم. لەبەرئەوەی لە یاسادا وا بڕیاری لە سەر دراوە.

لەبەر ئەم یاسا جوانە بوو، هاوبەش نەیدەتوانی ڕێگام لێبگرێت کە لە چەمەکەیاندا مەلە نەکەم. هەرچەندە من و هاوبەش بە دەگمەن دڵمان زویر دەبوو لە یەکتری، زۆربەی کات برادەر بووین و پێکەوە یاریماندەکـرد. ئەوبەری چەمەکە، هەر شـاخ و گردی بەرزبوو. شاخەکان بەلای منەوە بەرز دیاربوون. هەرچەندە شڤان دەیوت ئەگەر بێتو من شاخی شاهۆ ببینم، ئەوا هەرگیز ئەم گردە بچوکانە نـاونانێم شـاخ. جارجار بـە بەلەمەکەیماڵـی هانا و هـاوبەش دەڕۆیشتین بۆ چەمەکە و لەوێ مەلەماندەکرد.

شڤان دەڵێت ئەم شوێنە سەردەمی زوو دێوێکی گەورەی تێدا ژیاوە. ئەو کاتی خۆی، ئەو هەموو گرد و بەردە گەوررانەی لەناو ئەو گوزەرەدا داناوە. ئەو کاتە دێ بچکۆل نەبووە و کەسیش لەو ناوچەیەدا نەژیاوە.

من دڵخۆشم کە ئەو سەردەمە من لەوێ نەبووم. ئۆی خودایە گیان، کە بەختمان هەبووە کە یەکێک دێ بچکۆلی ئاوەدانکردۆتەوە. ئەگینا ئێستا لە شوێنێکی واخۆشدا خۆشمان ڕانەدەبوارد. شڤان وتی: "ئینجا چییە ئەو کاتە لە ئەشکەوتێکی شاخی شنروێدا دەژیاین. یەک ئەشکەوتی تەواو جوانی لێیە، لە ژێر دوو بەردی ئێجگار گەورەدایە."

ئێمە هەرکاتێک بۆ سەیران دەچووین بۆ ئەوێ، بەلەمەکەمان دەبەستەوە بە سنەوبەرێکەوە. دوایی هەموومان بە شاخەکەدا سەردەکەوتین. خۆی ئاسان نییە سەرکەوتن بەسەر شاخدا. شاخەکە کونێکی تێدا بوو کە ناومان نابوو کونی لوت. جێگەکە ئەوەندە تەسکبوو، هەرجارێک بەوێدا بڕۆیشتینایە لوتمان بەرکونەکە دەکەوت. دەبوایە هەموو جارێکیش بەوێدا تیپەڕ بووینایە، چونکە ئەو ڕێگا باریکە، تەنها ڕێگای ڕۆیشتنبوو. پاش تۆزێک ڕێگایەکی باریکی ترمان دەهاتەبەر. ڕێگاکە ئەوەندە تەسک بوو کە بە زەحمەت پیایدا دەڕۆیشتین. ترسناکترین شوێن بوو شوێنێک بوو کە ناومان نابوو دەستی پیاوێکی مردوو.

ئەگەر لەوێوە بکەوتینایەتە خوارەوە، ئەوا دەبووین بە دە پارچەوە. دوای ئەوەی کە بەو هەموو شوێنە سەختانەدا تێدەپەڕین، ئینجا دەگەیشتینە لـوتکەی شـاخە بەرزەکە. ئینجـا لەوێوە چـارەکە کاتژمێرێک دەبوایە بڕۆیشتینایە تا دەگەیشتینە ئەشکەوتەکە. ئێمە ناوی ئەو ئەشکەوتەمان نابوو، ئەشکەوتی شەهێن.

ڕۆژی یەک شەمە بوو، بڕیارماندا بچین بۆ سەیران. بە بەلەم چووینە ئەو بەرەوە و نان و تفاقمان لەگەڵ خۆماندا برد، بە ماڵەوەشمان وتبوو کە سەرانسەری ڕۆژەکە لەو دەور و گووزەرەی چەمەکەدا دەبین. شڤان بەلەمەکەی بە شوێنە تایبەتییەکەی خۆی بە سنەوبەرەکەوە بەستەوە. ئێمە قسەمان لەسەر ئەوە دەکرد ئایا کامیان خۆشترە، بە شاخـدا سەربکەوین یاخـود بەسەر داردا. هەمووـمـان بەلامانەوە خۆشتر بوو کە بە شاخدا سەربکەوین.

ئێمە شوێنێکی تازەمان دۆزییەوە ناومان نا "سکبردنە ناوەوە" ئەوەش لەبەرئەوەی هەر جارێک لـە وێوە بڕۆیشتینایە دەبوایە سکمـان ببردایەتە ناوەوە. بەڵێ، جێگەکە جێگەیەکی تازە نەبوو. ئێمە پێشتر چەندجـارێک پێیـدا هەڵزنابووین، بەڵام ئەوکاتانە ئـەم ناوەمان لێنەنابوو. کاتێک کـە پێم نایە سەر "دەستی پیاوی مردوو" بەدەنم تۆزێک کەوتە لەرزین، چونکە زۆر سەرنجڕاکێشبوو. دایکم هەرگیز ئەو شوێنەی نەدیبوو، ئەگینا ئەو ڕێگای نە دەدایین بەسەر شاخی



واسەختدا سەربکەوین. شڤان سەیرێکی خوارەوەی کرد و وتی:
"کێ دەیەوێت خۆی هەڵبداتە خوارەوە، قاچ یا دەست بەرز بکاتەوە."
بـە خودای گەورە کەسمان، نـە قاچ، نە دەستمان بەرز نەکردەوە.
چونکە قاچ و دەستمان پێویستبوو بۆ ئەوەی نەکەوینە خوارەوە. لە
کۆتاییدا گەیشتینە ئەشکەوتی شەهێن. لە تەنیشت ئەشکەوتەکەدا
شوێنێکی لێبوو، کە خۆر جوان دەیگرتەوە. لە وێدا سفرەکەمان ڕاخست،
برسیمانبوو چونکە خەڵکی کە دەچێت بۆ سەیران زوو برسی دەبێت.
پێش هەموو شتێک هەمووومان حەزماندەکرد یەکسەر نان بخۆین.
ئێمە ناوساجی و شیر و شەربەت و نانەچەورە و کولیچەمان پێبوو.
هەستیاریش شەش کوبەی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو هەریەکەمان



کوبەیەکی بەردەکەوت. بەڵام ئێمە کوبەی ساردمان بۆ نە دەخورا لە کاتێکدا ئەو هەموو ناوساجییە خۆشە هەبوو.

هانا و هاوبەش لەگەڵ خۆیاندا کێکیان هێنابوو، هەر زۆر خۆش بوو هەمووومان لێمان خوارد، لە کۆتاییدا هەر پارچەیەکی بچکۆلە لە کێکەکە مایەوە، شاد زۆر بە چێژەوە ئەویشی خوارد، چونکە ئەو زۆر حەزی لە کێک بوو.

هەستیار زۆر زویربوو، چونکە کەس بەلای کوبەکانی ئەودا نە دەچوو. هانا بەزەیی بە هەستیاردا هاتەوە بۆیە بە شادی وت:

"ئەگەر بێتو کوبەکانی هەستیار بخۆیت، ئەوا دوا پارچە کێک بە خەڵات وەردەگریت."

شاد تێری خواردبوو، بەڵام ئەو بە هەرحاڵ نیشتە سەر کوبەکان. چونکە زۆر حەزی لـە خواردنی کێکی ماڵی هانا و هاوبەش بوو. یەکەم کوبەی هەر لە چاو تروکاندنێکدا قووتدا. دووهەمیشی خوارد بەڵام تۆزێک لەسەرخۆ. هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا کاتێک کە دەستیکرد بە سێهەمیان. دوایی دەستیکرد بە خواردنی چوارەمیان، قەپێکی لێگرت و وتی "چارەیان دەچێتە خوارەوە" شڤان وتی:

"گەمژە پێی ناوترێت چارەیان، پێی دەوترێت چوارهەمیان."

شاد وتی: "وازملێبێنە، چوزانم، ئەوەندەم خواردووە لەوانەیە سکم شەقبەرێت."

ئیتر ئەو نەیتوانی کوبەیتر بخوات. هاناش پێیوت:

"قەیناکە، کێکەکەت حەڵالکردووە."

شاد وتی کە ئیتر ئەو لە ژیانیدا هەرگیز جارێکیتر، کوبە ناخوات. دوایی چووینە ناو ئەشکەوتەکەوە. شڤان وتی:

"خەڵکی سەردەمی کۆن کە لێرانەدا ژیاون. ئاخۆ ئەو قوڕبەسەرانە لە زستاندا، چەند سەرمایان بوو بێت."

ئەشکەوتەکە درزی گەورە گەورەی تێدابوو. لە زستاندا بەفر بە ئاسانی دەهاتە ناوەوە. هانا حەزیکرد ئەو یارییە بکەین کە ئێمە خەڵکـی سەردەمـی کۆنین. شڤان بەلایەوە یارییەکـی خۆشبوو. شڤان وتی:

"من و شاد و هەستیار دەچین بۆ ڕاوی ڕەشەوڵاخی سەردەمی کۆن وماڵییان دەکەین. بـا سارا و هانا و هاوبەش لـە ئەشکەوتەکە خەریکی چێشت لێنان بن."

بەلامەوە زۆر سەیر بوو. هەر یارییەکمان دەکرد، ئەوا هەموو کاتێک کوڕەکان شتێکیان هەڵدەبژارد کە خۆشتر بێت، بەڵام ئێمە نا، ڕۆڵی ئێمەش ئەوە بوو گسک بدەین و چێشت لێبنێین و خواردن گەرم بکەینەوە. هانا وتی با گسکێک لە لقی گەڵادار دروستبکەین و ئەشـکەوتەکەی پێ گسک بدەین. بـە هەندێک لقی جـوانی سنەوبەر و چنار و شۆڕەبی ئەشکەوتەکە بڕازێنینەوە. شڤان وتی:

"چیتان دەوێت بیکەن، هەرچەندە منداڵانەش بێت. وەرن کوڕینە، ئێمە دەبێت ڕاوی خۆمان بکەین."

شاد زۆر تێربوو، جوڵەی لێبڕابوو، هیچ توانای ڕاوکردنی ڕەشەوڵاخی سەردەمی کۆنی نەبوو. شڤان وتی:

"دەباشە بۆ خۆت لە ماڵەوە بمێنەرەوە، ئاگات لە ژن و منداڵەکانت بێت. ئەوەی لە هەمووی گرنگترە دەبێت هەموومان بە شتێکەوە خەریکبین." هانا وەڵامی دایەوە:

"ئا.. ئا... با شادیش یارمەتیمان بدات."

بەڵام شادی برام زۆر تێربوو، لە دەرەوەی ئەشکەوتەکە لەسەر گیاکە ڕاکشابوو. ئێمەش دەستمانکرد بە گسکدانی ئەشکەوتەکە و

ڕازاندنەوەی بە گوڵ و نەمام و گەڵا و لقەدار. زۆری پێنەچوو، شڤان و هەستیار بە قیژە و هاوار هاتنەوە بۆ ئەوەی گوێمان لێیان بێت و بزانین ڕاوەکەیان سەرکەوتو بووە. هانا وتی:

"من پێشتر قیژەی شڤانم گوێ لێبووە. بەڵام قەت لە ژیانمدا قیژەی وا گەورەم گوێ لێنەبووە." شڤان وتی:

"ئەم جۆرە قیژەیە، قیژەی سەردەمی کۆنە. لە سەردەمی کۆندا بەو جۆرە خەڵک قیژاندویانە، کاتێک لە ڕاوی ڕەشەوڵاخ هاتونەتەوە بۆ ماڵەوە."

ئەو شانی پێداکرد کە چەند ترسناکە ڕاوکردنی ڕەشەوڵاخ. ئەو باسی ئەوەی دەگێڕایەوە کـە لە ژیانیدا چەند ڕەشەوڵاخی کێوی ماڵـی کردوە و چەند دانەیتری لێکوشتوون. بەڵام لـەو هەموو ڕەشەوڵاخەی کـە شڤان گرتبوونی و کوشتبوونی، ئێمە بە چاوی خۆمان دانەیەکیشمان نەبینیبوو.

بـاران دەستیپێکرد. ئێمەش لەناو ئەشکـەوتەکە دانشتبویـن و ماڵەکەشمان خۆشبوو. بەڵام ئاسمان تەواو ڕەش داگیرسابوو. باران بە خوڕ دەباری ئیتر لەو بڕوایەدا نەبووین کە ئاووهەوا سەرانسەری ڕۆژەکە خۆشبکاتەوە. لە هەمووی خۆشتر ئەوە بوو کە خۆر لە پشتی هەورە چڕوپڕەکانەوە دەرکەوت. ئێمەش لە ئەشکەوتەکە هاتینە دەرەوە و سەیری چەمەکەمانکرد. زۆری نەبرد ئاووهەوا گۆڕا،

تیشکی خۆر بە جوانی پەخش ببووەوە بە سەر بەردەکان و ئەو شوێنەشدا کە ئێمە مەلەمان تێیدا دەکرد. شڤان وتی:

"دەڵێن چی، بە بەلەم بچینە ئەوبەر و لەوێ مەلە بکەین؟"

دوو ڕۆژ پێشتر دایکم پێی وتین کە نابێت لەوێ مەلەبکەین چونکە هێشتا کاتی مەلەکردن نەهاتبوو. شڤان وتی:

"ئا.. ئا..، دایکم ڕاستدەکات، ئەو کاتە ئاوەکە ساردبوو. بەڵام ئێستا ئاوەکە ساردنییە و کاتی مەلەکردن هاتووە."

بە سەوڵ لێدان چوینە ئەوبەری دورگەکە. جلەکانمان داکەند و بە پەلە هەڵماندانە سەر بەردەکان. پێشبڕکێی ئەوەمانکرد کێ زووتر خۆی بخاتە ناو چەمەکەوە. شاد بردییەوە چونکە ئەو کوبەکانی تۆزێک هەزمکردبوو. بەڵام خودایە گیان ناو ئاوەکە سارد بوو. کاتێک کە لە ئاوەکەدا هاتینە دەرەوە، قۆچوەشێن، سابرینە تورەکەی ماڵی هانا و هاوبەشمان بینی. بە هەردوو شاخە پێچ خواردووەکانییەوە لەناو دورگەکـەدا وەستابوو. قۆچوەشێن بـۆی نەبوو لە لەوەڕگا پەرژینکراوەکەدا لەگەڵ سابرینەکانی تردا بلەوەڕێت. چونکە ئەو بازیدەدا بەسەر پەرژینەکاندا و قۆچی دەدا لەم و لەو. بۆیە لە بەهاراندا دووریاندەخستەوە بۆ ئەم دورگەیە.



قۆچوەشێن بــە زەحمەتێکی زۆرەوە بەکێشدەکـرا بۆ دورگەکە. باوکی هەستیار و باوکی هانا و هاوبەش و هەروەها باوکی من. بە هەرسێکیانەوە بە پەت قاچ و دەستی قۆچوەشێنیان دەبەستەوە، دەیانخستە ناو بەلەمێکەوە و لەم دورگەیە بەرەڵایاندەکرد.

ئێمە هەمــوو حەپەسابــووین، کــە لە ئاوەکــە هاتینــە دەرەوە، قۆچوەشێن چاوەڕێیدەکردین. ئەو وەستابوو زەق بۆی دەڕوانین لە قەراخ ئاوەکەوە. ئێمە لە بیرمان چووبووەوە کە قۆچوەشێنی تووڕە لە دورگەکە بوو. هاوبەش قیژاندی:

"ئای باوکە گیان چیبکەین. خۆ ئێمە بیرمان نەبوو، ئەم بەڵای خوایە لێرەیە."

من لەو بڕوایەدابووم کە قۆچوەشێن زۆر ڕقی لە مرۆڤ هەستابێت. چونکە ئەو بە بەرچاوی مێیەکانییەوە بەسراوەتەوە بەرخەکانیش زەقزەق بۆیان ڕوانیوە و بە دیلکراوی قۆچوەشێن بەکێش کراوە بۆ دورگەکە. هەروەها خۆشنەبوو بۆ قۆچوەشێن چونکە ئەو تەنها و دووربوو لە بەرخەکانی.

لەوانەیە هەر لەبەرئەمەبێت، قۆچوەشێن لێمان تووڕەبوو. قۆچوەشێن وادەردەکەوت کە لە جاران تووڕەترە.



لەپڕ سەری چەماندەوە و بە غار هات بەرەو ڕوومان، هەموو گیانی قۆچوەشێن دەلەییەوە. هەستیار کـەوت و هەستایەوە و بە تاو ڕایکرد. نەک هەر ئەو بەڵکو هەمووومان. شاد و هانا و هاوبەش سەرکەوتنە سەربەردیکی بەرز. من و هەستیاریش سەرکەوتینە سەردارێک و شڤان خۆی شاردەوە لە ناو شەخەڵەکاندا. منیش هاوارمکرد لە شڤان:

"تۆ کە ئەوەندە ئازای ڕەشەوڵاخی سەردەمی کۆن ڕاودەکەیت. فەرموو ئەمە ئەرز و ئەوە گەز. قۆچوەشێنمان بۆ ڕاوبکە. ئەو لە پاڵتا وەستاوە." هانا و هاوبەش هاواریانکرد:

"ڕاستدەکات شڤان! فەرموو قۆچوەشێنمان بۆ ڕاوبکە."

بەڵام شڤان لـە پشتی شەخەڵەکەوە لـە ترساندا نوتقی لە خۆی بڕیبوو. نەیدەوێرا وەڵاممان بداتەوە، چونکە قۆچوەشێن دەیزانی ئەو لە کوێدایە. قۆچوەشێن توورەبوو، چونکە ماوەیەک قۆچی نەوەشاندبوو. ئەو لە ژێر دارەکەدا بە دیارمانەوە، وەک پاسەوان وەسـتابوو. ئەو دارەی کـە من و هەستیار بـە سەرییەوە بوویـن. جارجار لەپڕ قۆچوەشێن قۆچی وایدەوەشاند، دارەکە تەپووتۆزی لێدەبووەوە. کاتێک قۆچوەشێن زانی کە ئەمە کەڵکی نییە، چوو بۆ لای بەردەکە کە شاد و هانا و هاوبەشی پێدا هەڵزنابوو. ئەو لەوێ وەستا، هەرپیشی دەخواردەوە و زەق زەق دەیڕوانی.

هانا وتی:
"پیش بخۆرەوە قۆچوەشێنی تورە."
لە کۆتاییدا بیرمان لەوەکردەوە چۆنچۆنی ئێمە لەوێ خۆمان دەرباز بکەین. قۆچوەشێن لەوە نە دەچوو بێزاربووبێت لە پاسەوانی کردنمان.
شاد وتی:
"ئای بۆ کوبەیەک، خۆزگە ئێستا یەکێک لە کوبەکانی هەستیارم لەلا بوایە"
کاتێک کە شاد ناوی کوبەی برد، هەمووومان هەستمان بە برسێتی کرد. هانا هاواریکرد:
"شڤان نوستویت، بۆ دەنگت نییە؟"
شڤان سەری بەرزکردەوە و سەیرێکی دەوروبەری خۆیکرد. ئەو بە دزییەوە ویستی بچێتە سەر ئەو بەردەی کە شاد و هانا و هاوبەشی لە سەربوو. دەبوایە شڤان هەرگیز ئەو هەڵەیەی نەکردایە. قۆچوەشێن شڤانی بینی و لە خۆشیاندا هەڵبەزییەوە. وەک گوللە بەرەو ڕوی شڤان چوو. شڤان ڕایکرد و ئێمەش دەمانقیژاند. زۆر ناخۆشبوو کە شڤان دەخولایەوە بە دەوری شەخەڵەکەدا و قۆچوەشێنیشی بە دواوەبوو.
"ڕاکە.. ڕاکە... هاوبەش دەیقیژاند."
شڤان بە دەم ڕاکردنەوە هاواریدەکرد:
"نابینن چۆن ڕادەکەم."

شڤان قۆچێکی بەرکەوت و قیژەی لێهەستا، هاوارەکەشی لە هاواری سەردەمی کـۆن دەچوو. شڤان هەسـتایەوە و دەستی کردەوە بـە ڕاکردن.

قۆچوەشێنیش بە دوای شڤانەوە بوو. ئێمە هەر هاوارماندەکرد بەڵام بێسوود بوو.

لە دورگەکەدا کایەنێکی کۆنی لێبوو و نیوەی سەربانەکەی ڕووخابوو، هەر بە چۆڵی مابووەوە و بەکاری هیچ نەدەهات. لە بەختی شڤانی برام دەرگـای کایەنەکە کـرابووەوە، شڤانیش ڕایکرد بۆئەوێ و قۆچوەشێنیش بە دوایەوەبوو. منیش ئەو کاتە دەستمکرد بەگریان و وتم:

"خودایە گیان شڤانی برام بپارێزیت. بەخودا قۆچوەشێن شڤانی برام دەکوژێت."

ئەوەی ڕاستی بێت، زۆری نەبرد شڤانم بە سەربانی کایەنەکەوە بینی. ئەو بازێکیدایە خوارەوە و ڕایکرد بەرەو دەرگای کایەنەکە و دەرگاکەی داخست لە قۆچوەشێن. دوایی هاواری لێکردین:

"خۆ بە چاوی خۆتان بینیتان، چـۆن ڕەشەوڵاخی سەردەمی کۆنم بۆماڵیکردن."

لەو کاتە من و هەستیار وێرامان لە سنەوبەرەکە دابەزینە خوارەوە. دوایـی هەمووومان سەرکەوتینە سـەر سەربانی کایەنەکە و سەیری

قۆچوەشێنمانکرد. شاد تفێکی لە قۆچوەشێنکرد و وتی:
"عەمرت نەمێنێت، ناشیرین."
منیش وتم:
"هیوادارم بەرخەکەی من، خوری وەکو تۆ توورە دەرنەچێت."
دوایش ویستمان بڕۆینەوە بۆماڵەوە. شڤان وتی:
"هەمووتان بچنە ناو بەلەمەکەوە و چاوەڕێم بکەن. پێش ئەوەی قۆچوەشێن بزانێت بابەتەکە چییە، دەڕۆم دەرگاکەی لەسەر دەکەمەوە و بە ڕاکردن دێمەوە بۆ لاتان. هەرچەندە قۆچوەشێن سابرێنێکی تورە و گەمژەیە، بەڵام خۆ نابێت دەرگای لە سەر دابخەین و لە برساندا بمرێت."
ئێمەش شڤان چۆن ویستی وامانکرد، هەروەکو جاران ئێمە گوێمان لە قسەی ئەو دەگرت. کاتێک کە بە سەوڵ لێدان دوورکەوتینەوە لە دورگەکە، قۆچوەشێن لە دوورەوە وەستابوو، وا دەردەکەوت کە بە ڕۆیشتنمان خەمبار بێت. شڤان بە فیزێکەوە پێی وتین:
"ناتانەوێت، ڕەشەولاخی ترتان بۆ ڕاوبکەم."
ئێمە ئەو ڕۆژە نەمانویست شڤان ڕەشەولاخیترمان بۆ ڕاوبکات. ئێمە برسی و ماندوبووین. دەمانویست زوو بگەینەوە ماڵەوە.

# نیوەی هاوین

لەوانەیە هاوبەش ڕاستبکات کە دەڵێت هاوین خۆشترین وەرزی ساڵە. من زۆر حەزدەکەم بڕۆم بۆ قوتابخانە.
کاتێک کە مامۆستا خواحافیزیمان لێدەکات، پشووی هاوینمان دەست پێدەکات و منیش دڵم پڕدەبێت لە گریان و فرمێسک بە چاومدا دێتە خوارەوە.
چونکە ئیتر بە درێژایی سێ مانگ مامۆستاکەم نابینم. بەڵام پاش چەند ڕۆژێک قوتابخانەم بیردەچێتەوە و دڵم ڕۆژ بە ڕۆژ خۆشتر دەبێت. چونکە هەرچۆنێک بێت لە پشووی هاوین خۆشتر نییە.
یەکەمین ئێوارەی پشوودانمان پێشەمانە بڕۆین بـۆ چەمەکەی ماڵـی هانا و هاوبەش و لەوێ ماسی بگرین. هیچ شتێک نییە بەلامانەوە ئەوەندەی ماسیگرتن خۆش بێت.
ئێمە هەموومان تەپەدۆر و قولاپ و تەلی ڕاوەماسیمان لەگەڵ خۆماندا بردبوو بۆ چەمەکە. ئەمانەمان پێشتر لە دوکانەکەی مامەشێخ کڕیبوو. شەش توولە نەمامی باریکمان پێبوو. بەهۆی ئەم نەمامە باریکانەوە دەمانتوانی قوولاپەکە دوورتر هەڵبدەین بۆ ناو چەمەکە.
شڤان ناوی ئەم ئێوارەیەی نابوو ئێوارەی ماسیگرتن.
لـە دەوروبەری چەمەکەدا گردێکـی مامناوەندی لێبوو. گردەکـە

نە بەرزبوو نە نزم. ئێمە هەمیشە لەوێ تا درەنگ دەماینەوە. ئەو شوێنە خۆی ناوی دورگەی ماسییە سوورە بوو. هاوبەش دەڵێت ئەمە هەرناوەکەی وایە، ئەگینا بە دەگمەن ماسییە سوورەی تێدا ڕاوەکرێت. بەهەرحاڵ شاد ماسییەکی گەورەی گرت و هاناش دوو ماسی بچکۆلانە.

کە گەڕاینەوە ماڵەوە، من و هاوبەش لە سەر پێپلیکانەی موبەقەکەمان دانشتبووین و جێگازی مێشوولەکانمان دەژمارد. من چواردە مێشوولە دابووی بە قاچی ڕاستمەوە و پێنج مێشوولە بە قاچی چەپمەوە. هاوبەشیش بە هەر قاچێکییەوە نۆ جێگازی مێشوولەی پێوە بوو. ئەم جێگازی مێشوولانە، دەکرا بکرایە بە پرسیارێکی ماتماتیک. هاوبەش وتی:

"با ئەمە بنوسینەوە بۆ مامۆستاکەمان. ئەگەر هاتوو سارا چواردە جێگازی مێشوولە بە قاچێکییەوە و پێنج بەویتریانەوە بوو، هەروەها هاوبەشیش نۆ جێگازی مێشوولە بە قاچی ڕاست و نۆی تریش بە قاچی چەپییەوە بوو، ئایا بە هەردوکیانەوە چەند جێگازی مێشوولەیان پێوەیە؟"

بەڵام لەپڕ هاتەوە بیرمان کە ئێمە خەریکی کارێکی گەمژانە بووین. لە پشووی هاوینماندا خەریکی ماتماتیک بووین. ئیتر لە دواییدا هەر جێگازی مێشوولەکانمان دەخوراند هەتا کاتی نوستنمان هات.

من ئێستا ئەو ئاهەنگە خۆشەتان بۆ دەگێڕمەوە کـە دانشتوانی ئاوایی ساڵانە دەیگێڕن بە بۆنەی نیوەی هاوینەوە.
ئێمە کۆڵەکەیەکی دارمان هەبوو کە لە مێرگەکەی ماڵی هەستیار دامانابوو. هەموو ساڵیک ئێمە ئەو کۆڵەکەیەمان دەهێنا و بە گوڵ و گەڵا دەمانڕازاندەوە. پێش هەموو شتێک سواری عەرەبانەی پووشەکەمان بووین، ماوەیەکی زۆر لە دارستاندا خەریکی کردنەوەی گەڵای سەوز و لقی نەمامی ناسک بووین. باوکم عەرەبانەکەی لێدەخـوڕی. تەنانەت نازە بچکۆلەشمان لەگەڵدا بـوو. ئەو هەر پێدەکەنی و دڵخۆش دیار بوو، هەستیار نەمامێکی دابووە دەستی نازە، ئەویش هەر خەریکی ڕاوەشاندنی نەمامەکە بوو. جاروبار هەستیار گۆرانی بۆ نازە دەوت:
"نازە نازە چارەکە پیازە، نازە عەیارە و کەمێک بەنازە"
ئەوەی ڕاستی بێت هەمووومان گۆرانیمان وت. هەتا باجی توباش کە گەڵای لەگەڵماندا کۆدەکردەوە، ئەویش تۆزێک گۆرانی بۆ وتین. بەڵام شڤان گۆرانی وتنی لێتێکداین ئەو لەجیاتی ئەوەی بڵێت:
"ئەوا هاوینە و خۆر هەڵهاتووە و گوڵ و گوڵزارە"
شڤان دەیوت:
"ئەوا هاوینە و خۆشی و سەفایە تەپاڵەی مانگا پڕ لەوەڕگایە."
هەرچەندە شڤان ڕاستیدەکرد، لەوەڕگاکەی ماڵی هانا و هاوبەش

پڕیبوو لـە تەپاڵە. بەس پێویستی بەوە نەدەکـرد شڤان گۆرانی بەسەر تەپاڵەدا بڵێ و زەوقمان لێتێکبدات.
کاتێک کە گەڕاینەوە بۆ ئاواییەکەمان. من و باجی توبا ڕۆیشتین سەرو چەپکێک گوڵی زۆر جوانمان چنی لە نزیکی ئەو جێگەیەوە، کـە کارگەی دروستکردنـی تەختەی لێبوو. دوایـی چووین بۆ مێرگەکەی ماڵی هانا و هاوبەش. لەوێ کاک زۆراب و قالەمان بینی، ئەوان بە گوڵ و گەڵا خەریکی ڕازاندەوەی کۆڵەکەکە بوون. ئێمەش کەوتینە یارمەتیدانیان. کە تەواو بووین هەموو پێکەوە کۆڵەکەکەمان بەرزکردەوە و خستمانە ناو ئەو چاڵە تایبەتییەوە کە پێشتر بـۆی هەڵکەندرابوو. زۆری نەبـرد هەمووومان بـە دەوری کۆڵەکە ڕازەوەکەدا هەڵپەڕکێمان دامەزراند و ماوەیەکی زۆر خەریکی هەڵپەڕکێ و گۆرانی وتن بووین. باوکی هاوبەش مۆسیقایەکی هەڵپەڕکێی بۆ لێداین لەگەڵ چەند گۆرانییەکی خۆشدا.
بێجگە لـە باپیرە و نازە هەمووومان خەریکی هەڵپەڕکێ بووین. باپیرە لەسەر کورسییەک دانیشتبوو گوێی لێدەگرتین و نازەشی لە کۆشدا بـوو. زۆری پێنەچوو نازە دەستیکرد بـە ڕاکێشانی ڕیشی باپیرە. کاتێک باوکـی نازە ئەمەی بینی یەکسەر هات و نازەی خستە سەر قەڵادۆشکانی. بەو جۆرە نازەش بەشداربوو لە هەڵپەڕکێ کردنەکەدا.

باپیرەی بەستەزمان نەیدەتوانی هەڵپەڕکێ بکات، من لەو بڕوایەدا نەبووم ئەو بۆئەمە زویر بوو بێت. ئەو بە تەنها دەیوت:

"هۆهۆیایا، زەمانێکە هەڵپەڕکێم نەکردووە!"

دوایی لە مێرگەکەدا هەمووومان دانیشتین لە دەوری سفرەیەکی گەورە کە هەموو خواردنێکی خۆشی لەسەر بوو، کە دایکم و دایکی هەستیار و دایکی هانا و هاوبەش ئامادەیانکردبوو. باپیرەش سێ پیاڵە چای خواردەوە، ئەو زۆر حەزی لە چا خواردنەوە بوو. گوێمان لێبوو هەموو جارێک باپیرە دەیوت:

"چا پێویستییە، بێ چا ئیدارە ناکەم."

من هیچ حەزم لە چا نییە. بەڵام کاتێک چایەکە لەناو ئەو سەوزەگیا جوانە لێدەنرێت تامێکی زۆر خۆشتری هەیە، لەو چایەی کە لەماڵەوە لێدەنرێت. ئەو کاتەی کە ئێمە خەریکی چا خواردنەوە بووین، بولبولێک نیشتەوە بە لقە دارێکەوە، ماوەیەکی زۆر بە دەنگێکی خۆش خەریکی خوێندن بوو.

یاریمانکرد هەموو جۆرە یارییەک. لە هەمووی خۆشتر ئەوە بوو کە دایک و باوکەکان بەشداربوون لە یارییەکاندا. خۆی لەوانەیە ئەوەندە خۆش نەبێت، ئەگەر بێت و ئەوان هەموو ڕۆژێک یاریمان لەگەڵدا بکەن. بەڵام ئێستا کە جەژنی تێپەڕبوونی نیوەی هاوینە ئەوان دەتوانن یاریمان لەگەڵ بکەن. بازە بە دەورماندا ڕایدەکرد و

دەوەڕی. من لەو بڕوایەدام کە ئەویش خۆشی بەسەربردبێت لە چەژنی تێپەربوونی نێوەی هاویندا.

ئەو شەوە بۆمان هەبوو، کەی بمانەوێت بنووین. باجی توبا وتی، ئەگەر بێت و یەکێک نۆ جار بەسەر پەرژیندا باز بدات و هەروەها نۆ گوڵی جیاوازیش بچنێت و بیانخاتە ژێر سەرینەکەیەوە. ئەوا شەو خەو بەو کەسەوە دەبینێنت، کە لە داهاتودا دەبێتە هاوسەری. من و هانا و هاوبەش بەلامانەوە زۆر خۆشبوو کە بازبدەین بەسەر پەرژینەکاندا. هەرچەندە ئێمە بڕیاری خۆمان دابوو شوو بەکێ بکەیـن. من دەبێت شـوو بکەم بـە هەستیار. هانا و هاوبەش شووبکەن بە شڤان و شاد. شڤان بە هانای وت:

"دەتەوێت بازبدەیت بەسەر نۆ پەرژیندا. بەڵێ، بازی خۆت بدە، بەڵام توخودا لەجیاتی من خەو بە یەکێکی ترەوە ببینە. نەک لەبەرئەوەی من بڕوام بەم قسە پڕوپوچانە نییە، بەڵام زۆر دەترسم وا دەربچێت."

باجی توبا پێی وتین لە کاتی بازدان و گوڵ کۆکردنەوەدا نابێت بە هیچ جۆرێک پێبکەنین، یان قسە بکەین. شڤان وتی:

"بەقسەم بکەن هەر لە ئێستاوە واز لە چنینی گوڵ و بازدان بهێنن."

منیش وتم:

"باشە بۆچی؟"

"لەبەر ئەوەی کە ئێوە دوو دەقیقە ناتوانن بێدەنگبن و حیلکەحیلک نەکەن."

ئێمە گوێمان نەدایە قسەی کوڕەکان، یەکەمجار لە پەرژینەکانی ماڵی هەستیارە وە دەستمان پێکرد. لەوێوە چوینە ئەو دارستانەی کە لە پشتی ماڵی ئەوانەوە بوو.

ئای کە دارستان ترسناکە، بە تایبەت کاتێک کە تاریکە. هەرچەندە تەواو تاریک نەبوو بەڵام بەهەرحاڵ ڕووناکیش نەبوو. دارستانەکە زۆر بێدەنگ و سامناکبوو هەتاکو باڵندەکانیش وازیان لە خوێندن هێنابوو. بۆنێکی زۆر خۆش دەهات لە گەڵای دار و گوڵەکان. دوای ئەوەی کە یەکەم بازماندا سەرو گوڵمان چنی.



شتێک کە من لێی تێنەدەگەیشتم، نەمدەزانی بۆ ئەوەندە پێکەنینم دەهات. ئەمەش هەر لەبەرئەوە بوو کە دەمزانی نابێت پێبکەنم.

هەرکەبازماندا بەسەر یەکەمین پەرژیندا پێکەنین لە گیانمدا دەستپێکرد.

کوڕەکان هاتن بۆ لامان تاوەکو بمانخەنە پێکەنین. شاد بە هاوبەشی وت:

"ئاگات لە خۆتبێت، پێ نەخەیتە ناو تەپاڵەکانەوە."

هاوبەش وەڵامیدایەوە:

"قسەی هیچ کوا ئێرە تەپاڵەی لێیە."

دوایی هاوبەش هاتەوە بیری، کە ئەو دەبوایە قسەی نەکردایە، من و هاناش خۆمان پێڕانەگیرا دەستمانکرد بە پێکەنین.

شڤان وتی:

"حەی.. حەی... خۆ ئێوە بۆتان نییە قسە بکەن و پێبکەنن!"

ئێمەش خراپتر پێکەنین. کوڕەکان بە دەورماندا ڕایاندەکرد. جاروبار قژیان ڕادەکێشاین و نوقورچیان لێدەگرتین. ئەمەش هەر لەبەرئەوە بوو کە بمانخەنە پێکەنین. شڤان وتی:

"ئبیلبوبیلێمۆک"

هەرچەندە ئەم وشەیەی شڤان هیچ مانایەکی نەبوو. کەچی من و هانا و هاوبەش خۆمان پێڕانەگیرا و دامانە قاقای پێکەنین. من دەستەسڕێکم گرتبوو بەدەممەوە بۆئەوەی پێکەنینەکەم دەرنەچێت، کەچی دەنگی پێکەنینەکەم چاکتر دەهات.

کاتێک کە گەیشتینە نۆهەمین پەرژین، پێکەنینەکەمان وەستا، ئـەو کـاتە تەنها تووڕە بوویـن، چونکـە کوڕەکان خەونەکەیـان لێتێکداین.

شەو هات و منیش نۆ گوڵەکەم خستە ژێر سەرینەکەمەوە. بەڵام ئەو شەوە خەوم بە کەسەوە نەبینی کە دەبێتە هاوسەرم. من زۆر دڵنیام بۆیە من خەوم بەو کەسەوە نەبینیوە کە دەبێتە هاوسەرم، چونکە کوڕەکان منیان هێنایە پێکەنین. هەرچۆنێک بێت، هەستیار بیەوێت و نەیەوێت دەبێت لە داهاتوودا ببێتە مێردی من.



# گێلاس فرۆشتن

لە ئاواییەکەماندا دارگێلاسی زۆری لێیە. لە باخچەکەی ماڵی ئێمە و هانا و هاوبەشدا چەند دارێکی گێلاسی تێدایە. تەنها لە باخچەکەی ماڵی هەستیاردا، دارگێلاسی لێنییە. دارگێلاسەکانی ماڵی هانا و هاوبەش گێلاس دەگرن، بەڵام گێلاسەکان هەتا بڵێی وردن. ماڵی هەستیار دارهەرمێیەکی جوانیان هەبوو لەگەڵ دوو دارهەڵوژەدا، کە هەڵوژەی بچوکی زەردی خۆشیان دەگرت. لەلای پەنجەرەکەی باپیرەیشەوە دارهەنجیرێکی گەورەی لێبوو. لقەکانی شۆڕببوونەوە بۆ سەر زەوییەکە. ساڵانەش بەرێکی بێسنووری دەگرت. باپیرە دەیوت هەر چەندە هەنجیرمان بوێت دەتوانین لێیبیکەینەوە. بەڵام نابێت هەنجیر لە لقە نزمەکان لێبکەینەوە. چونکە ئەو لقە نزمانە بۆ نازە دانراون. باپیرە حەزیدەکرد نازە بە دەستی خۆی هەنجیر لێبکاتەوە، هەرچەندە منداڵیش بێت. ئێمە هەنجیرمان لە لقەکانی نازە نە دەکردەوە. چونکە خۆمان دەتوانین سەربکەوین بە دارهەنجیرەکەدا و هەنجیر لێبکەینەوە.

ئەمساڵ دارگێلاسەکانمان گێلاسێکی ئێجگار زۆری گرتبوو. ئێمە سەردەکەوتینە سەر دارگێلاسەکە و بە دڵی خۆمان تاکو تێر دەبووین گێلاسمان دەخوارد.

جاری وا هەبوو ئەوەندە گێلاسمان دەخوارد کە تووشی سک ئێشە دەبووین.

ئێمە ساڵ نییە تووشی سک ئێشە نەبین، بەتایبەت ئەو کاتەی کە گێلاس پێدەگات. بەڵام کە گێلاس تەواو بوو سک ئێشەمان تووش نابێت تا ئەوکاتەی هەڵوژەی ماڵی هەستیار پێدەگات.

من و شڤان و شاد هەریەکەمان دارگێلاسی خۆمانمان هەبوو، کە بە تەواوەتی هەر هی خۆمان بوو.

دارگێلاسەکەی من زۆر گەورە نەبوو، بەڵام ساڵانە گێلاسێکی ڕەشی خۆشــی بەتامی دەگرت. ئەمساڵ هەر زیاد لــە پێویست گێلاسی گرتبوو، هەروەها دارگێلاسەکانی شڤان و شادیش.

دایکم هەموو ساڵێک گێلاسی وشک دەکردەوە. ئەو گێلاسی لەسەر سینییەک دادەنا و دەیخستە ناو فڕنەکەمانەوە و بەو جۆرە گێلاسەکانی وشک دەکردەوە. دایکم دوایی گێلاسە وشکراوەکەی هەڵدەگرت بۆ زستان و شۆربای گێلاسی بۆ لێدەناین.

شڤان ڕۆژێکیان ویستی تۆزێک گێلاس وشکبکاتەوە. سینییەک گێلاســی خستە نــاو فڕنەکەوە. دوایــی چوو خــۆی بشــوات و سینییەکــەی بیرچوو لــە فڕنەکەدا. دوایی کــە شڤان ســینییە گێلاســەکەی هێنابــووە دەرەوە. لــەجیاتی گێلاســی وشککراوە، کۆمەڵێک شتی خڕی وردی سووتاو لە سەر سینییەکە بوون.

دایکم بە شڤانی وت:

"ڕۆڵە چۆن گێلاس بەوجۆرە وشک دەکرێتەوە."

ئێمە ئەوەنـدە گێلاس بـە دارەکانمانەوە بـوو. هەرگیز خـۆمان نەماندەتوانی هەمـووی بخۆین.

هەرچەنـدە هانا و هاوبەش و هەستیار پارمەتیان دەداین لە خواردنیاندا. ئێوارە کە لە لای باپیرە بووین و ڕۆژنامەمان بۆ دەخـوێندەوە. لە ڕۆژنامەکەدا باس کرابوو، لـە پایتەخت نرخـی کیلۆیەک گێلاس سەد فلسە. شڤان خەفەتـی زۆریخوارد کـە دارگێلاسەکانمان لە پایتەخت نەبوون.

شڤان وتی:

"ئەوکاتە من لە سوچی کۆلانێکی پایتەختدا دەوەستام و گێلاسم دەفرۆشت، وازم نەدەهێنا، هەتا وەکو پادشا دەوڵەمەند دەبووم."

شڤان بیری لەوە دەکردەوە ئەگەر بهاتایە دارگێلاسەکانمان لە پایتەخت بوایە ئەوا ئەو پارەیەکی باشی دەستدەکەوت.

بەڵێ، پارەیەکی زۆر. شڤان خەریک بوو ئەبلەق دەبوو کە بیری لەو هەموو پارە زۆرە دەکردەوە کە لەکیسی چوو بوو.

هاناش وتی:

"ئەگەر ئێمەش چەمەکەمان لە بیاباندا بوایە، ئەوا لیترێک ئاومان دەفرۆشت بە سەد فلس."

هانا بۆیە وایوت، بۆ ئەوەی شڤان تووڕە بکات. بەڵام من بە دوورم نە دەزانی کە شەو داهات شڤان لەسەر جێگەکەی تا درەنگ بیر لە گێلاس فرۆشتن و پایتەخت بکاتەوە. ئەو لە هەر کیلۆیەک گێلاس سەد فلسی دەستدەکەوت، ئەگەر خۆی و دارگێلاسەکانی لە پایتەخت بوونایە.

ڕۆژی دوایی شڤان پێی وتین با گێلاس بفرۆشین. ئەو دەیویست ئێمە بچووینایە بۆ شەقامەکەی ئەودیوی گەورەدێ و گێلاسەکانمان لەوێ بفرۆشتایە. ئەو شەقامە بە هاویناندا ئۆتۆمۆبیلی زۆری لە سەر بوو.

شڤان پێی وتین:

"بە دڵنیایی ئەو ڕێگایە ئۆتۆمبێلی پایتەختیشی پێدا تێپەڕ دەبێت."

من و شادیش وتمان ئێمەش گێلاس دەفرۆشین. لە ناو خۆماندا دوکانێکمان کردەوە و ناومان نا "دوکانی گێلاسی دێ بچکۆل."

هانا و هاوبەش و هەستیاریش بەشدار بوون. هەرچەندە ئەوان گێلاسیان نەبوو، بەڵام ئەوان گێلاسیان کۆدەکردەوە بەیانی زوو، کاتژمێر پێنج هەستاین. دەستمانکرد بە لێکردنەوەی گێلاس.



له دەوروبەری کاتژمێر هەشتدا چەند زەمیلەیەکمان پڕکرد. تێر نانی بەیانیمان خوارد. دوایی ملی ڕێگامان گرت بۆ گەورەدێ. لەوێ چووین بۆ دوکانەکەی مامەشێخ دەستەیەک زەرفی کاغەزمان کڕی بە بیست فلس. ڕەنگی زەرفەکان قاوەیی بوون. بیست فلسەکەمان پێشتر لە دەخیلەکەی شاد بە قەرز دەرهێنا بوو.

مامەشێخ بە سەرسوڕمانەوە لێیپرسین.

"ئەرێ ئەو هەموو زەرفانەتان بۆ چییە."

شڤان وەڵامی دایەوە:

"بۆ گێلاس فرۆشتنمانە."

ئێمە زەمیلە پڕگێلاسەکانمان لە داڵانی دوکانەکەی مامەشێخ دانابوو، هەستیار پاسەوان بوو بە دیاریانەوە.

"ئافەرین منداڵینە، من حەزم لە گێلاسە و دەمەوێت دوو کیلۆتان لێبکڕم"
شڤان چووە دەرەوە و زەمیلەیەک گێلاسی لەگەڵ خۆی هێنایە ژوورەوە، مامەشێخیش دوو کیلۆی لێکێشا و سەد فلسی داینێ.
مامەشێخ پێشی وتین لە دەڤەرەکەماندا نرخی کیلۆیەک گێلاس پەنجا فلسە. ئینجا ئێمەش بڕیارماندا کیلۆیەک گێلاس بە پەنجا فلس بفرۆشین.
شاد بیست فلسەکەی خۆی وەرگرتەوە کە لە دەخیلەکەی بە قەرز دەرمانهێنابوو. هەشتا فلسیشمان بۆ مایەو. مامەشێخ دەعوەتی نوقڵی ترشوشیرینی کردین. کاتێک کە هەستیار ئێمەی بینی نوقوڵمان وەرگرت وەکو ئەوەی ئاگر لە لەشیدا بێت بە فڕکە خۆی گەیاندە مامەشێخ. هەستیار نوقڵەکەی وەرگرت و چۆن هات بەو شێوەیە گەڕایەوە بۆ جێگەکەی خۆی. ئێمەش زۆر سوپاسی مامەشێخمانکرد و ڕۆیشتین. کە چووینە دەرەوە هەستیار ئەو گێلاسانەی کۆکردبوەوە کە لە زەمیلەکانەوە کەوتبوونە خوارەوە.
شڤان بە تووڕەییەوە هاواریکرد بەسەر هەستیاردا:
"ئەوە خەریکی چیت؟"
"گیلاسەکان کۆدەکەمەوە."
شەقامەکە زۆر دوور نەبوو لە گەورەدێوە. لە پایز و زستاندا ئۆتۆمۆبیل

کەم بەو شەقامەدا تێدەپەڕی و زۆربەی ئۆتۆمۆبیلەکانیش ئۆتۆمۆبیلی باربوون. بەڵام لە هاویندا ئۆتۆمۆبیلی زۆر بە شەقامەکەدا دەهاتن و دەچوون. خەڵکی شار دەهاتن بۆ سەیری دیمەنە جوانەکانی لادێکەمان. ئەو دیمەنە جوانانەی کە بەلای ئێمەوە ئاسایی بوون. شڤان وتی:

"ئەوان بۆیە دێن بۆ ئێرە، حەزیان لێیە ئاژەڵی کێوی و دیمەنی جوانی سروشت ببینن."

ئێمە لە سەر پارچەیەک تەختەی گەورە نووسیبوومان "گێلاس بۆ فرۆشتن."

هەر کاتێک ئۆتۆمبێلێک بە شەقامەکەدا تیپەڕبوایە تەختەکەمان بەرز دەکردەوە و ڕاماندەوەشاند.



بەڵام ئۆتۆمبێلەکان هەرخێرا بە لاماندا دەڕۆیشتن هیچیان نە دەوەستان. شڤان وتی لەوانەیە ئەوانەی کە سەیارە لێدەخوڕن وا بزانن کە لە سەر تەختەکە نووسراوە "لەسەرخۆ لێخوڕن" یاخود شتێکیتر لەم بابەتە. شڤان ڕاستیدەکرد، هەر لەبەر ئەم هۆیەش بوو کە ئۆتۆمبێلەکان دەگەیشتنە ئاستی ئێمە پێیان خێراتردەنا بە بەنزیندا.

بەڵام شاد ئەمەی بەلاوە خۆشتربوو لە گێلاس فرۆشتن. کاتێک ئۆتۆمبێلەکان بە خێرایی بە شەقامەکەدا تێپەڕ دەبوون. ئەو لە خۆشیاندا خەریکبوو گێلاس فرۆشتنەکەی لە بیر دەچووەوە. شاد چاوێکی دەکرد بە هەزار چاو، دەیڕوانییە ئۆتۆمبێلەکان تا ئەوان لە چاو ون دەبوون.



ئەو دەیزانی چ جۆرە سەیارەیەکن و چ مارکەیەکیشیان هەیە، هەموو مارکەیەکی سەیارەی دەناسییەوە. شاد دانیشتبوو لە قەراخ ڕێگاکەدا و خۆی واپیشاندەدا کە ئەویش سەیارە لێدەخوڕێت و لاسایی دەنگی مەکینەی سەیارەیدەکردەوە.

ئەوەی ڕاستیش بێت کاتێک شاد خەریکی لاساییکردنەوە بوو لەوەدەچوو مەکینەکەی شاد هەڵەیەکی تەکنیکی گەورەی تێدابێت. چونکە لاسایی کردنەوەکەی شاد لە دەنگی مەکینەی ئۆتۆمبێل نەبێت لە هەموو دەنگێکیتر دەچوو. هانا وتی:

"وازبێنە شاد ئەم لاسایی کردنەوەیەی تۆ هەرگیز لە دەنگی مەکینەی ئۆتۆمبێل ناچێت. هەر تەنها لە وڕەوڕەکەی شاد خۆی دەچێت."

شڤان تووڕە بوو، چونکە ئۆتۆمبێلەکان نەدەوەستان، وتی:

"دەبێت من فێریانبکەم ئەمانە چۆن بوەستن."

کە ئۆتۆمبێلێک لە دوورەوە دەرکەوت، شڤان چووە ناوەڕاستی شەقامەکەوە و تەختەکەی ڕادەوەشاند. کاتێک ئۆتۆمبێلەکە زۆر نزیک بووەوە شڤان ڕایکردە قەراخ شەقامەکە. شۆفێری ئۆتۆمۆبیلەکە ئیستۆپێکی توندی گرت، کە بە باشی گوێمان لە چریکەی تایەکانیبوو کە دەخشان بەسەر جادەکەدا. شۆفێرەکە لە سەیارەکەی هاتە دەرەوە و پەلی شڤانی توندگرت پێیوت:

"تۆ شایەنی ئەوەیت بیرازێکی واچاکتبکەم، هەفتەیەک نە توانیت بە قنەوە دابنیشیت. جارێکیتر ئەمە دووبارە نەکەیتەوە."
شڤانیش بەڵێنیدا بە شۆفێرەکە، کە جارێکیتر ئەوە دووبارە نەکاتەوە. بڕوام پێبکەن، شۆفێرەکە لە خۆیەوە دڵی نەرمبوو، کە زانی شڤان بۆ گێلاس فرۆشتن ئەو بەزمەی ناوەتەوە. بۆیە یەک کیلۆ گێلاسی لێکڕین و دوای ئەوە چوو بە ڕێگای خۆیەوە.
ئای خودایە گیان کە شەقامەکە تەپوتۆزێکی ئێجگار زۆری هەبوو. هەر ئۆتۆمبێلێک تێپەر بووایە هەموو شەقامەکە دەبوو بە تەپوتۆز. بۆئەوەی گێلاسەکەمان تۆزاوی نەبێت سـەری زەمیلەکانمان بە کاغەز گرتبوو. ئەمەش کارێکی ژیرانە بوو. بەڵام خۆمانمان پێ دانەدەپۆشرا. کاتێکێش کە ئۆتۆمبێلەکان تێدەپەڕین، تەپوتۆزێکی چڕیان لـە دوای خۆیان بە جێدەهیشت و هەمووی خۆیدەکرد بە دەمووچاو و کونە لوتی ئێمەدا. تەپوتۆزەکە بێتاقەتی کردین بۆیە منیش وتم:
"ئۆی...، کە تەپوتۆز ناخۆشە."
بەڵام شڤان پێی وتم:
"سارا تۆ بۆچی ناڵێیت ئۆی...، کە تیشکی خۆر ناشیرینە! ئۆی...، کە دەنگی بولبول ناسازە! ئەوە کێیە بڕیاریداوە کە دەبێت حەزی لە جوانی تیشکی خۆر بێت، بەڵام ڕقی لە تەپوتۆز بێت؟"

ئەو دەمە بڕیارماندا کە حەزمان لە تەپوتۆز بێت. کاتێک ئۆتۆمبێلێک تێدەپەڕی، هەموو تەپوتۆزەکەش بە جۆرێک دەچوو بە چڕوچاوماندا، کە بە زەحمەت یەکتریمان دەبینی. شڤان پێی دەوتین:

"چ تەپووتۆزێکی ناسک و جوانە."

شادیش وتی:

"خۆزگە ئۆتۆمبێلەکان لەمە زیاتر تەپووتۆزیان بکردایە."

زۆری نەبرد سەیارەیەکی بار بە خێرایی هات، ئای... کە تەپوتۆزێکی زۆری بە دواوەبوو. من قەت لەو بڕوایەدا نەبووم ئەوەندە تەپوتۆز هەبێت لە دنیادا. هەورێکی چڕوپڕ. هاوبەش لە ناوەڕاستی تەپوتۆزەکەدا وەستابوو و دەستی بە حەواوە بەرزکردبووەوە و دەیوت:

"ئای... تەپوتۆزێکی چەند عەنتیکەیە."

بەڵام دوایی هاوبەش ناچاربوو بکۆکێت و هیچی زیاتری بۆ نەوترا. دوایی کە تەپوتۆزەکە نیشتەوە، ئێمە سەیری یەکتریمانکرد. هەموومان وەک خەڵوز ڕەش بووین. هانا لوتی سڕی و دەستەسڕەکەی نیشاندایین کە بە تەواوەتی ڕەش بوو. دوایی هەمووومان لوتمان سڕی، دەستەسڕەکانمان ڕەشی قەترانیبوو.

هەرچەندە ئەوەندە خۆشبوو کە تەپوتۆز وەکو باران دەباری. ئێمە هەمووومان دڵگرانبووین کە هیچ سەیارەیەک نەوەستا گێلاسمان لێبکڕێت.

لـه دواییدا شڤان وتی کـه ئێمه لەوانەیە لـە شوێنێکی خراپدا وەستابین بۆیە ئۆتۆمبێلەکـان ناوەستن. شەقامەکـە ڕێکە بۆیە ئۆتۆمبێلەکان خێرا لێدەخوڕن.

بەلای شڤانەوە باشتروابوو، دوکانە سەفەرییەکە بگوازینەوە بۆ شوێنێکیتر کە شەقامەکە پێچاوپێچ بێت. ئێمەش ئەمەمان بەلاوە باشبوو. گواستمانەوە بۆ ئەو شوێنەی کە شەقامەکە دوو پێچی لێدەبووەوە بە دوای یەکتردا. ئێمەش بە باشمانزانی بە یەک ڕیز لە قەراغی شەقامەکە بوەستین دەستی یەکتربگرین. تەختەکەمان کە لە سەری بە گەورەیی نووسیبوومان "گێلاس بۆ فرۆشتن"، بەرزمان دەکردەوە و نزمان دەکردەوە.

شڤان وتی:

"ترستان نەبێت بە خودای گەورە هەموو گێلاسەکان دەفرۆشین."

شڤان ڕاستیکـرد و زۆربەی ئۆتۆمبێلەکان وەستان و ئۆتۆمبێلی یەکەم، پیـاو و ژنێک و چـوار منداڵـی تێدابـوون. منداڵەکـان هاواریاندەکـرد گێلاس.. گێلاس..، باوکیان سێ کیلـۆ گێلاسی لێکڕین، دایکی منداڵەکانیش وتی:

"ئۆی..، کە باش بوو وەستاین، ئێمە زۆر برسی و تینومان بوو."

ئەوان لە گێلاسە ڕەشەکانی منیان کڕی. پیاوەکە بۆی گێڕاینەوە، کـە ئەوان گەشتێکی دووریان لەبەردەمدایە. ئەوان دەچـوون بۆ

دەرەوەی وڵات. بەلامەوە سەیربوو کە گێلاسەکانم دەڕۆیشتن بۆ دەرەوەی وڵات، کەچـی خۆم کـە خاوەنەکەیم لـە دێ بچکۆل بەجێمابووم. کاتێک کە شڤان گوێی لێمبوو پێی وتم:

"قسەی هیچ، تۆ دەبێت لەوە تێبگەیت کـە منداڵەکان هەموو گێلاسەکە دەخۆن پێش ئەوەی بگەنە دەرەوەی وڵات."

بەڵام من وتم:

"بە هەرحاڵ گێلاسەکانم هەر دەڕۆنە دەرەوەی وڵات، ئەگەر بێت و لە سکی منداڵەکانیشدا بن."

ئۆی... کە گێلاسێکی زۆرمان فرۆشت. پیاوێک بە تەنها زەمیلەیەکی لێکڕین، لەو زەمیلەیەبوو کە ئێمە گێلاسەکانی شادمان تێدا دانابوو. پیاوەکـە پێی وتین کە ئەوان شەربەتــی گێلاسی لێدروستدەکەن، چونکە ئەوان زۆر حەزیان لە شەربەتی گێلاسە.

شادی برام هەر لە بەر ئەوەی تووڕەم بکات وتی:

"چەند سەیرە ئەم دنیایە. من گێلاسەکانم دەکرێن بە شەربەت، کە چی خۆم پەرداخێک شەربەتی لێناخۆمەوە."

لە کۆتاییدا هەرچی گێلاسمان پێبوو هەموویمان فرۆشت. شەش دینار لە دەغیلەکەماندا بوو. ئەو دەغیلەیەی لەگەڵ خۆماندا هێنابوومان بۆ ئەوەی پارەکەی تێدادابنێین. ئەم جارەیان پیاوە داناکان کارێکی باشیان لێوەشایەوە. شەش دینار، پارەیەکی ئێجگار زۆربوو.

پارەکەمان لە نێوان خۆماندا بەشکرد. یەکی سەر و دینارمان بەرکەوت. هەرچەندە هانا و هاوبەش و هەستیار داری گێلاسیان نەبوو، بەڵام ئەوان لە بەیانی زووەوە هەستابوون و گێلاسەکەیان لەگەڵمانـدا لێکردبـووە و هەروەها لەگەڵماندابـوون تـا هەموو گێلاسەکانمان فرۆشت.

هانا وتی:

"ئێستا ئێوە هیچ گێلاستان نەماوە، بەڵام ئێوە بۆتان هەیە چەند گێلاستان بوێت بە ویستی خۆتان لە باخەکەی ئێمەدا بیخۆن."

هەستیاریش کاتێک کە دینارەکەی وەرگرت پێی وتین:

"ئێوەش بۆتان هەیە کە هەڵوژەکەمان پێگەیشت بە ویستی خۆتان هەڵوژە بخۆن. بۆ ئەوەی ئیتر کەس نەڵێت شتەکان بە دادپەروەرانە دابەش نەکراون."

پێش ئـەوەی بگەڕێینەوە ماڵـەوە چووین بـۆ پاقلاوەخانەکەی گەورەدێ. سـەرو پاقلاوە و ساردیمان خـوارد. پاقلاوەکەی مـن پڕیبوو لە گوێز هەر زۆر خۆشبوو. دوایی باقی دینارەکەم خستە ناو دەغیلەکەمەوە. کاتێک کە گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە دایکم کە چاوی بە من و شڤان و شاد کەوت، دەستیکێشا بە یەکدا و وتی:

"هەرگیز لـە ژیانمدا گێلاس فرۆشی وەکـو ئێوە پیس و پۆخڵـم نەبینیوە."

دایکم پێی وتین کە یەکسەر بچین بۆ حەمام و خۆمان بشۆین. هەر ئەوکاتە هاوبەش هاواریکرد کە حەمامەکەیان داخستووە.

ماڵی هاوبەش حەمامێکیان هەبوو لە لای چەمەکەیانەوە بوو. من دەستێک جلی پاکم لەگەڵ خۆم هەڵگرت. بەناو لەوەڕگا پەرژینکراوەکەدا تێمتەقاند بۆئەوێ. بە جۆرێک ڕامدەکرد کە لەبەر پێما، تەپوتۆز بەرزدەبووەوە.

لە حەمامەکەدا دانیشتین هەتا جوان ئارەقمان کردەوە و ئەو تەپوتۆزە نازدارەمان لە خۆمان کردەوە. جارجار باسی ئەوەشمان دەکرد لەوانەیە دوکانێکی فرۆشتنی هەڵوژەش بکەینەوە.

ناو حەمامەکە زۆر گەرمبوو. خەریکبوو لە گەرمادا دەتەقین. دوایی خۆمان بۆ نەگیرا، بۆئەوەی خۆمان فێنک بکەینەوە خۆمان خستە ناو چەمەکەوە.

چەند خۆشبوو شەڕە ئاومانکرد و مەلەمانکرد و چووینە ژێر ئاوەکەوە.

کە هاتینە دەرەوە ئیتر ئەو تەپوتۆزە نایابەمان پێوە نەمابوو. لە ئاوەکەشدا کەوتینە لوتسڕین بۆئەوەی ڕەشاییەکەی ناو لوتمان پاک بکەینەوە.

بەڕاستی ئاو و هەوایەکی خۆشبوو. ئێمە لە قەراغی چەمەکە خۆمان دابووە بەرخۆر. کوڕەکان هاتن بۆ لامان و شڤان وتی:

"ئۆی..، کە تیشکی خۆر جوان دەبریسکێتەوە."

هەستیار دایە قاقای پێکەنین و وتی:

"ئۆی..، کە باڵندەکان جوان دەخوێنن."

# من و هاوبەش حەزدەکەین ببین بە مامۆستای باخچەی منداڵان

ڕۆژێکیان کوێخای ئاوایی گەورەدێ ئاهەنگێکی گەورەی سازکرد بە بۆنەی جەژنی لەدایکبوونییەوە. دایک و باوکی من و هانا و هاوبەش و هەستیار و باپیرە بانگ کرابوون. بەڵام ئێمەی منداڵانی ئاوایی و کاک زۆرابی ڕەنجبەر و باجی توبا بانگهێشت نەکرابوون. دایکی هەستیار خەمبار بوو. لەبەرئەوەی ئەو نەیدەتوانی بڕوات بۆ ئاهەنگەکە و کچە بچکۆلانەکەی لە ماڵەوە بە تەنها بەجێبهێڵێت. ئەوەش لەبەرئەوەبوو، کە ئەو کەسێکی شکنەدەبرد بە دیار نازەوە بێت. من و هاوبەش بە دایکی نازەمان وت کە ئێمە دەتوانین ئاگامان لە نازە بێت. چونکە ئێمە حەزدەکەین کە گەورەبووین ببین بە مامۆستای باخچەی منداڵان. هەر لەبەر ئەمەش دەمانویست هەر لە ئێستاوە ئاگامان لە منداڵی بچکۆلانە بێت. بۆ ئەوەی بزانین حەزمان لەم کارە دەبێت یان نا. هەستیار پێی ناخۆش بوو ئێمە ئاگامان لە نازەی خوشکی بێت، بۆیە وتی:

"بەخودا جوانە ئێوە دەتانەوێت، بەسەر خوشکە بچکۆلەکەی منەوە خۆتان بکەن بە مامۆستا."

هەستیار خۆی حەزیدەکرد ئاگای لە خوشکە بچکۆلەکەی بێت.

بەڵام ئەو بۆینەدەکـرا، لەبەرئەوەی ئەو دەبـوایە دانی بدایە بـە مریشکەکان و ئالیکی بدایە بەمەڕ و ماڵات و شیری مانگا زەرەدی بدۆشیایە. ئەمەش هەمووی لەبەرئەوەی باوک و دایکی هەستیار لە ماڵەوە نەبوون. هاناش حەزیدەکرد یارمەتیمانبدات، بەڵام ئەو هەڵامەتێکی قورسی تووشببوو، لە سەر قەرەوێڵەکەی کەوتبوو، بە زەحمەت قسەی بۆ دەکرا. دایکی هەستیار وەک گوڵ گەشایەوە، زۆری پێخۆش بوو کە ئێمە دەمانویست ئاگامان لە نازە بێت. من و هاوبەش لە دایکی نازە زۆرتر دڵمان خۆش بوو. بۆیە نوقورچێکم لە قۆڵی هاوبەش گرت و جاروبار دەموت:

"تۆ بڵێی ئەمە خۆشدەربچێت؟"

هاوبەشیش وتی:

"خۆزگە ئەوان زوو دەڕۆیشتن و ئێمەش خێرا دەستمان بە کاری خۆماندەکرد."

کاتێک دایکان و باوکان خۆیان ئامادە دەکەن بۆ ئاهەنگ.. ئەوان زۆریان پێدەچێت، کەچی باپیرە هەر لە کاتژمێر شەشی بەیانییەوە حازر و ئامادە بوو. هەرچەندە کاتژمێر (دە) دەبوایە ئەوان بچوونایە بۆ گەورەدێ. باپیرە قاتە ڕەشە تازەکەی لەگەڵ جوانترین کراسیدا لـەبەردابوو. هـەر ئەوەندە باوکی هانا و هاوبەش ئەسـپەکەی بەستەوە بـە عەرەبانەکەوە، باپیرە چـوو دانیشت لە عەرەبانەکەدا.

چاوەڕوانی دەکرد لە کاتێکدا هێشتا دایکی هانا و هاوبەش جلی ئاهەنگیان لەبەر نەکردبوو. "ئەرێ باپیرە، تۆ لەو بڕوایەدایت، لە ئاهەنگەکەدا کاتێکی خۆش بەسەربەریت."

باپیرە وەڵامیدایەنەوە و وتی کە ئەو لەو بڕوایەدایە. بەڵام من وابزانم کە پاپیرە تۆزێک خەمبار دیاربوو. چونکە کاتێک کە ئەو وەڵامی داینەوە هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و وتی: "هۆهۆیایا، پیاو نازانێت، چۆن فریای ئەو هەموو ئاهەنگە خۆشانە بکەوێت."

هەرچەندە باوکی هانا و هاوبەش وتی باپیرە، لەم ماوەی پێنج ساڵەی دواییەدا، ئەمە یەکەمین جارە کە بۆ ئاهەنگ بانگهێشت بکرێت. ئیتر من نازانم باپیرە بۆ ئەو هەناسە قووڵەی هەڵکێشا.

دایکی هەستیار هەموو شتێکی بۆ من و هاوبەش بە وردی ڕوونکردەوە. زۆری نەبرد ئەوان کێشایان بە ئەسپەکاندا و بە خۆیان و عەرەبانەکانیانەوە بۆی دەرچوون. دایکی هەستیار پێی وتین کە نازە بەرینە دەرەوە بۆ ئەوەی ئاو و هەوای پاک وەربگرێت. کاتژمێر دوانزە دەبوایە خواردنمان پێبدایە. خواردنەکەش خۆی پێشتر دایکی نازە ئامادەی کردبوو. ئێمە بەس گەرمکردنەوەمان لە سەر بوو. دوایش نازە بخەینە ناو جێگەکەیەوە بۆ ئەوەی پاش نیوەڕۆ دوو کاتژمێرێک بخەوێت. هاوبەش لە خۆشیدا نەیدەزانی چی بکات و پێی وتم: "بەخودا زۆر کاتێکی خۆش بەسەردەبەین."

منیش وەڵاممدایەوە:

"هانام بە دەمت."

من کە گەورە بووم دەمەوێت ببم بە مامۆستای باخچەی منداڵان.

من زۆر لەمە دڵنیا بووم. بۆیە بە هاوبەشم وت:

"هیچ زەحمەت نییە چاودێری منداڵی ووردبکەیت. دەبێت هەمیشە لە سەرخۆ و بە زمانی شیرین قسە لەگەڵ منداڵاندا بکەیت. تەنها بەو شێوەیە ئەوان گوێ ڕایەڵتر دەبن، من هەموو ئەو شتانەم لە ڕۆژنامەیەکدا خوێندووەتەوە."

هاوبەشیش وتی:

"ڕاستدەکەیت بێگومان وایە. دەبێت بە زمانێکی شیرین و لەسەرخۆ لەگەڵ منداڵاندا هەڵسوکەوت بکەیت."

منیش پێموت:

"هەندێک کەس هەن سەر لە منداڵان دەشێوێنن. هەر دەقیژێنن بـە سەریاندا. هەر لەبەرئەمەیە ئـەو منداڵانە لاسار و هاروهاج دەردەچن. هەروەها ئەمەشم لە ڕۆژنامەکەدا خوێندۆتەوە."

هاوبەش وتی:

"کێ هەیە بیەوێت بقیژێنێت بە سەر ئەو نازە جوانە قژ ئاڵتوونییەدا."

ختوکەیەکی نازەمدا کاتێک ئەو لە سەر بەتانییەک دانیشتبوو. بە خـۆشییەوە دەیڕوانییە گژوگیای سـەوز و دەوروبەرەکـەی.

نازە چەناگەیەکی خڕی بچکۆلانەی هەبوو، دوو چاوی تەواو شین. چوار ددانی لە سەرەوە هەبوو چواریش لە خوارەوە. کاتێک کە ئەو پێدەکەنی، ددانە وردەکانی وەکو دەنکە برنج وابوون.

نازە ناتوانێت ئێستا قسە بکات. تەنها وشەیەک نەبێت کە هەمیشە بە دەمییەوەیەتی "چۆنی چۆنییە"، لەوانەیە ئـەو مەبەستی شتی جیاواز بێت، هەرجارەی ئەو دەیوت چۆنی. کەسمان تەواو دڵنیا نە دەبووین نازە مەبەستی چییە. هاوبەش پێشنیاریکرد:

"دەڵێی چی سارا، با نازە لە عەرەبانەکەیدا بەرینە دەرەوە."

منیش وتم: "باشە."

هاوبەش نازەی خستە ناو عەرەبانەکەوە و پێیوت:

"وەرە نازە جوان. وەرە دڵەکەم با بڕۆین بۆ پیاسە کردن."

هاوبەش زۆر بە زمانێکی نەرم و جوان قسەی لەگەڵ نازە کرد. هەر بەو شێوەیەی کە لە ڕۆژنامەکەدا باسکرابوو. ئەو زوو زوو بە نازەی دەوت:

"نازە بچکۆل، جێگەکەت خۆشە لە عەرەبانەکەدا."

"باشتروایە نازە ببەستینەوە بە عەرەبانەکەوە بۆ ئەوەی نەکەوێتە خوارەوە."

نازە حەزی لە بەستنەوە نەبوو. بەڵام ئێمە نەمانوێرا ئەو نە بەستینەوە و بیبەینە دەرەوە. بۆیە ناچاربووین نازە بە قایشێکی باریک لە ناو

عەرەبانەکەیدا ببەستینەوە. کاتێک نازە نەیدەتوانی بە ویستی خۆی بە پێوە ڕابوەستێت و بڵێت: چۆنی چۆنی. لە پڕ یەک قیژەیکرد. بەڵام چ قیژەیەک ئەوەندە گەورە بوو کە لەوانەیە خەڵکی لەوپەڕی ئاوایيەکەوە گوێیان لەو قیژەیە بوبێت. هەستیار لە گەورەکەوە بە ڕاکردن هات بە دەم قیژەکەوە و تووڕە بوو لێمان:

"سارا و هاوبەش: ئەرێ ئێوە بۆ وا لە خوشکەکەم دەکەن، ناشێ لێتاندابێت!"

"گەمژە لێدانی چی! ئێمە چۆن لە منداڵ دەدەین. باش بزانە کە ئێمە هەمیشە بە نەرم و نیانی لەگەڵ منداڵدا دەدوێین و هەڵسوکەوت دەکەین."

بەڵێ، هەستیار لە ئێمە باشتر دەزانێت کە چۆن چاودێری خوشکەکەی بکات.



دوایی ئێمەش قایشە باریکەکەمان کردەوە و ڕێگامان بە نازەدا بە ویستی خۆی چی بوێت بیکات. ئەو حەزیدەکرد بە پێوە بوەستێت و بڵێت: "چۆنی چۆنی." ئێمەش ڕێگەمانپێدا.

نازەش بە بەردەوامی دەیوت "چۆنی چۆنی." زۆری پێنەچوو کە گەیشتینە چیمەنێکــی شێدار هەندێک شـوێنی ئاوی بە سەرەوە مابووەوە. نازە شوێنەکەی بینی و لە عەرەبانەکەی هاتە خوارەوە. ئێمەش وتمان با وازی لێبێنین بزانین ئەو چی دەکات؟ بینیمان نازە چیکرد. منداڵ شتێکی سەیرە، من وامدەزانی کە نازە ناتوانێت بـەو قاچە بچکۆلانەیەوە ئەوەنــدە خێرا ڕابکات. بەڵام لـە چاو تروکاندنێکدا، نەمانزانی نازە چۆن خۆی هەڵدایە ناو چیمەنە تەڕەکەوە. هەستیار خۆی بە ئێمەی وتبوو کە ڕێگا لە خوشکەکەی نەگرین، ئەو چیویست با بە ویستی خۆی بیکات. بە هەرحاڵ نازە لەوانەیە ویستبێتی بچێتە ناو ئاوەکەوە. ئەو گیانی تەواو تەڕبوو، دەیقیژاند و مۆڕەی لە ئێمە دەکردە. وەکو ئەوەی بڵێت کە خەتای ئێمە بوو ئەو جلەکانی تەڕ بووە. بەڵام ئێمە هەر لە سەرخۆ بە نەرم و نیانی قسەمان لەگەڵ نازە کرد و خستمانە ناو عەرەبانەکەوە و ڕامانکێشا بەرەوماڵەوە بۆ ئەوەی جلەکانی بگۆڕین. سەرانسەری ڕێگاکە نازە قیژاندویەتی. هەستیار تووڕەبوو کە نازەی بەو شێوەیە بینی. ئەو قیژاندی بە سەرماندا:

"ئەرێ ئێوە خەریکی چین، بۆ سەرتان لە خوشکەکەم تێکداوە و هەر دەقیژێنێت؟

هاوبەشیش بە هەستیاری وت:

"لە سەرخۆ، بە ئاقلانە و نەرم و نیان قسەمان لەگەڵدا بکە، ئێمەش منداڵین، هەرچەندە لەوانەیە تۆزێک گەورە دیاربین."

هەستیار گەڕا بەدوای جلی پاکدا. ئیتر دوای ئەمە هەستیار گەڕایەوە بۆناو گەورەکە. بەڵام پێش ئەوەی بڕوات پێی وتین: "ئاگاتان لە نازە بێت کاتێک جلەکانی دەگۆڕن دەبێت لەسەر قەدعە دایبنێن."

هەستیار ئەمەی پێ وتین، بەڵام من لەو بڕوایەدانیم کە خۆی پێشتر لە کاتی جل گۆڕیندا جارێک نازەی لەسەر قەدعە دانابێت. من و هاوبەش هەرچیمانکرد نەمانتوانی نازە بخەینە سەر قەدعەکەی. ئەو خۆی وەکو کۆتەرەدار ڕەقکردبوو، هەر دەیقیژاند و نەیدەویست لەسەر قەدعەکە دابنیشێت. لە داخا وتم:

"منداڵی لاسار و نەفام."

بەڵام زوو پەشیمان بوومەوە، کاتێک بیرمکردەوە کە نابێت لەگەڵ منداڵی بچکۆلە بەو جۆرە قسە بکەیت. لەبەرئەوەی کە نازە نەیدەویست لەسەر قەدعەکە دابنیشێت، ئیتر ئێمە ناچاربووین کە جلە وشکەکانی لەبەر بکەین من نازەم گرتبوو و هاوبەشیش هەوڵیدەدا جلەکان بکاتە بەری. نازە دەیقیژان وەکو ماسی دەردەچوو لە دەستمان.

چارەکێکی برد تا جلەکانمان لەبەرکرد. دوای ئەوە من و هاوبەش هەردووکمان تەواو ماندو بووین. دیسانەوە نازە دەستیکردەوە بە "چۆنی چۆنی" زۆرینەبرد بە گاگۆڵکێ چووە ژێر مێزی موبەقەکەوە و تەنەکەیەک میزیکرد. کاتێک هەستایەوە سفرەی مێزەکەی ڕاکێشا. سفرەکەش دوو پیاڵە چای لە سەربوو، پیاڵەکان کەوتنە خوارەوە و شکان.

"منداڵی هاروهاج."

هاوبەش لەبەرخۆیەوە دەیوت:

"ئا.. ئا.. ئا..، بە نەرم و نیانی و لەسەرخۆ، قسە لەگەڵ منداڵاندا بکەن!"

هاوبەش شوێن میزەکەی وشککردەوە، پیاڵە شکاوەکانیشی کۆکردەوە.



ناچار بووین موبەقەکە کسگ بـدەین بۆئەوەی پارچە شووشە نەچێت بە قاچی نازەدا. منیش پانتۆڵە تەڕەکەی نازەم داکەند و دوایی گەڕام بە دوای جل و بەرگدا بۆ ئەوەی لەبەری نازەی بکەم.



نازە بۆیدەرچووە دەرەوە بەرە و گەوڕەکە دەڕۆیشت. ئەو لە نیوەی ڕێگابوو کە ئێمە هێنامانەوە. هەستیار سەرێکی لە گەوڕەکەوە دەرهێنا و قیژاندی:

"ئەرێ ئێوە ئەقڵتان لە شوێنی خۆیدایە، چۆن دەیەڵن نازە بە ڕووت و قوتی بڕواتە دەرەوە؟"

"باشبزانه که ئێمه ئەقڵمان له شوێنی خۆیدایه، خۆ نازه ئیزنی له ئێمه وەرنەگرتووه که ڕایکردۆته دەرەوە."

نازەمان کێشکرد بۆ ژوورەوه و هەرچۆنێک بێت پانتۆڵەکەمان لەبەرکرد، هەرچەنده ئەو نەیدەهێشت جلی لەبەربکەین و حەزیدەکرد ڕووت و قووت بێت.

نازه جوانترین کراسی لەبەردابوو. چونکه هەستیار هیچ کراسێکی تری بۆ نەدۆزرابووەوە. کراسەکه زۆر جوان بوو، سپی، گوڵی پەمەیی پێوه بوو. منیش به نازەم وت دەبێت ئاگات لەو کراسه جوانەت بێت. من وام به نازه وت، بەڵام ئەو لەوه دەچێت له من تێنەگەیشتبێت. ئەو هەر دەیوت: "چۆنی چۆنی" و بەرەو تەباخەکه ڕۆیشت، هەر ئەوەندەمزانی کۆمەڵێک پەڵەی ڕەشی گەوره به کراسه جوانەکەیەوه بوو. ویستمان کراسەکەی پاکبکەینەوه هەرچی هەوڵێکماندا بێسوود بوو. نازه پێدەکەنی که ئێمه به فڵچەکه پاکماندەکردەوە. له ئەو وابوو ئێمه یاری لەگەڵ دەکەین.

کاتژمێر دوانزه بوو، هاوبەش وتی:

"نازه برسییەتی، ئێستا کاتی خواردنی هاتووه."

ئێمەش بەپەله له مەنجەڵێکدا خواردنەکەمان گەرمکردەوە. من نازەم گرته باوەشم و هاوبەش خواردنی دەدایه. ئەو دەمی باش و جوان کردبووەوه و هاوبەش وتی:

"له ڕاستیدا، نازە منداڵێکی بچکۆلە و ئێجگار زیرەکە."

نازە دەستیکردەوە بە "چۆنی چۆنی." لە پڕ کێشای بە کەوچکەکەدا و خواردنەکە پڕا بە دەموو چاومدا. هاوبەش دەستیکرد بە پێکەنین زۆری نەمابوو قاپەکەی لە دەست بکەوێتە خوارەوە. من تۆزێک تووڕەبووم لە هاوبەش. نازەش دەستیکرد بە پێکەنین، بەڵام من لەو بڕوایەدا نیم کە نازە بە من پێکەنیبێت. من لەو بڕوایەدام ئەو وابزانێت کە خواردن پڕاندن بە دەمووچاودا کارێکی زۆر ئاسایی بێت.

ئەوەی ڕاستی بێت ئەو تێر ببوو، ئیتر نەیدەویست زیاتر بخوات. ئەو دەمی خۆیدەگرت و پاڵی بە کەوچکەکەوە دەنا و نیوەی زیاتری شۆرباکە دەڕژایە سەرجلەکانی.



ئێمە شەربەتماندایە لە پەرداخێکدا، نیوەی پەرداخە شەربەتەکەی ڕژاندە سەر کراسەکەی. ئیتر چیتر کراسەکەی سپی نەبوو، سەوز و سورو ڕەش بوو. تەنها لە هەندێک شوێنیدا کراسەکە سپی بوو بەتایبەت لەو شوێنانەی کە خواردن یان شەربەتی بەرنەکەوتبوو.

هاوبەش وتی:

"من زۆر دڵخۆشدەبم ئەگەر بێت و نازە تۆزێک خەوی لێبکەوێت."

منیش سەرم بۆ لەقاند و وتم:

"نووستنی نازە دڵی منیش خۆشدەکات."

دوای زەحمەتێکی زۆر جلەکانمان لەبەری نازە داکەند و جلی نووستنمان لەبەرکرد. من بە هاوبەشم وت:

"ئەگەر یەکێک پێویستی بە خەوی پاش نیوەڕۆ هەبێت، ئەوا نازە نییە ئێمە خۆمانین."

نازەمان خستە ناو جێگەی نووستنەکەیەوە کە لە سوچێکی ژوورەکە دانرابوو. دەرگامان لە سەری داخست. نازەمان بە جێهێشت و زۆری نەبرد هەتا توانی نازە دەستیکردەوە بە قیژەقیژ و گریان. گریانێک هەتا خوا بڵێ بەس. ئێمە گوێمانگرتبوو خۆمان واپیشاندەدا کە گوێمان لێنییە. بەڵام ئەو خراپتر و خراپتر دەیقیژاند، لە دواییدا هاوبەش سەرێکی بردە ژوورەوە و بە نازەی وت:

"بێدەنگ بە، هاروهاج!"

خۆی پێویسته به زمانی شیرن و نەرم و نیان و له سەرخۆ، لەگەڵ منداڵاندا بدوێیت، بەڵام هەمیشە کەس ناتوانێت بەو جۆره هەڵسوکەوت لەگەڵ منداڵاندا بکات. هەرچەنده ئەوه ڕاسته که له ڕۆژنامەکەدا باسکرابوو:

"منداڵان لاسارتر دەردەچن ئەگەر بێت و گەوره هەر بقیژێنێت به سەریاندا."

نازه زۆر گریا ئێمەش ناچاربووین بچینه لای. که ئەو ئێمەی بینی هەستایه سەرپێ له سەر جێگەکەی دەستیکرد به هەڵبەز و دابەزکردن و چۆنی چۆنی وتن. ئەمه بەردەوام بوو هەموو کاتەکه که لەلای بوین. دەسته بچکۆلانەکانی دەردەهێنا له نێو تووڵه دارەکانی دەوری قەرەوێڵەکەیەوه دەستی به ڕوومەتمدا دەهێنا و کاتێک که ڕوومەتم نزیککردەوه و لەوەدابوو بڵێم:

"ئای نازه چەند منداڵێکی جوان و ئاقڵه."



نازە گازێکی لێگرتم کە تا دوو ڕۆژ جێگەی گازەکە شین ببووەوە. نازەمان جارێکیتر خستە ناو جێگەکەیەوە و هەوڵماندا پەتۆیەکی پێدا بدەین. بەڵام ئەو بە شەق لـە چاوتروکاندنێکدا پەتۆکەی لە سەرخۆی لابرد. دووهەمین جار کە پەتۆکەی لەسەرخۆی لابرد، ئیتر ئێمە وازمان لێهێنا. ئێمە پێمانوت خەوخۆش و دەرگاکەمان لە سەر داخست. یەکسەر نازە دەستیکردەوە بە قیژە و گریان، بەڵام چ قیژەیەک زەوی دەلەراندەوە.

"نەخێر، ئیتر تازە تاقەتمان چوو."

هاوبەش وتی: "وازی لێبێنە با بۆ خۆی هەر هاواربکات."

ئێمەش لە موبەقەکە دانیشتبووین و دەمانویست قسە لەگەڵ یەکتری بکەین، بەڵام ئەستەمبوو. چونکە نازە خراپتر و خراپتر و خراپتر دەیقیژاند، بە جۆرێک دەیقیژاند کە گوێی زەلامی کەڕدەکرد. جاروبار تاوێک بێدەنگ دەبـوو، ئەوەش بۆ ئەوە بـوو هەناسە وەربگرێت و دوایی زیاتر بقیژێنێت. هاوبەش وتی:

"لەوانەیە نـازە تووشی سـک ئێشە هاتبێت، لەوانەیە ڕیخـوڵە کوێرەی بێت یا نەخۆشییەکی تر."

بە ڕاکـردن چووینەوە بۆلای نازە. ئەو بـە پێوە وەستابوو لە سەر جێگەکەی و چـاوی پڕ فرمێسک بوو. بەڵام هەر کە ئێمەی بینی کەوتە هەڵبەز و دابەز و دەستیکردەوە بە "چۆنی چۆنی."

هاوبەش وتی:

"وەرە با بڕۆین، ئازار لە سکی مندا هەیە، بەڵام لە سکی ئەم منداڵەدا نییە."

دەرگاکەمان لێداخستەوە و جارێکیتر دانیشتینەوە لە تەنیشت مێزی موبەقەکەدا، چین چین ئارەقمان دەکردەوە کە گوێمان لە قیژەی نازە بوو. تا دەبوو قیژەکردنەکەی گەورەتر دەبوو. لە کۆتایدا بە هەرحاڵ بێدەنگبوو. لـە هەمووی خۆشتر ئەوەبوو کاتێک نازە نووست. من و هاوبەش دەستمانکرد بە شەترەنجکردن. کاتێکی زۆر خۆشمان بەسەربرد و بە هاوبەشم وت:

"منداڵی بچکۆلانە وا باشە لە ناو جێگەکەیان بن، بەس نییە بەلای کەمەوە دەزانین کە لەوێن. لە هەمانکاتدا گوێمان لە دەنگێکی سەیربوو لە ژوورەکەی نازە. لە قریوەیەک دەچوو کە منداڵان دەیانکرد کاتێک خەریکدەبن بە شتێکی خۆشەوە. من وتم:

"نەخێر، نازە بە تەواوەتی شوڵی لێهەڵکێشاوە، تۆ بڵێی تا ئێستا خەوی لێنەکەوتبێت."

لەسەرخۆ چووینە لای ژوورەکە و لە کونی کلیلەکەوە سەیری جێگەکەی نازەمان کرد. کەچی نازە لە ناو جێگەکەیدا نەبوو! بە پەلە چووینە ژوورەوە و نازەمان بینی لە ناو زۆپا کاشییەکەدا بوو. ئەو زۆپایەی کە لە هاویندا تازە پاککرابوەوە. زۆپاکە جوان بوو

هەڵبەت پێش ئەوەی کە نازە لەناویدا بێت. نازە لە ناوەڕاستی زۆپاکە دانشتبوو، بۆیاخی پێڵاوی بە دەستەوەبوو. نازە بۆیاخی پێڵاوی بە قژەوە، بە دەموو چاوییەوە بە هەردوو دەستییەوە بوو، هەروەها بە جلەکانیشییەوە. سەیری پەنجەی پێی نازەت بکردایە لە پەنجەی پێی ڕەشپێستێک دەچوو. دەوروبەری زۆپاکەش کە پێشتر جوان پاککرابووەوە، نازە سواغیدابوو بە بۆیاخی پێڵاو. لەوانەیە باوکی هەستیار کاتێک پێڵاوەکەی بۆیاخ کردووە، بیریچووە سەری قوتووی بۆیاخەکە بنێتەوە. کاتێک نازە چاوی بە ئێمە کەوت دەستیکردەوە بە "چۆنی چۆنی" وتن. هاوبەش پێی وتم:

"ئەرێ لە ڕۆژنامەکەدا هیچی تێدا نە نوسراوە ئایا بۆ نابێت لە منداڵ بدرێت."

منیش وەڵامم دایەوە :

"لەبیرم نەماوە."

هاوبەش وتی سەرم بە تەواوەتی ژان دەکات.

نازە هەستایەوە لەناو زۆپاکـەدا، بەرەو ڕوومان هات بـۆئەوەی بیگرینە باوەش. هاوبەش سوورسوور بووەوە و هاواری لە نازەکرد:

"نەجوڵێیت. ڕاوەستە لە جێی خۆتدا، منداڵی هاروهاج."

بەڵام نازە گوێی لە هاوبەش نەگرت، خێرا ڕایکرد بۆ لای و دەستی بۆیاخاوی هێنا بـە دەمو چاویدا. منیش دەستمکـرد بە پێکەنین

هەمان پێکەنین کـە ئەو بە من پێکەنـی کاتێک نازە شۆرباکەی کرد بە دەموچاومدا. دوایی وتم:

"ئەگەر ئێستا دایکی هەستیار نازە ببینێت لەوانەیە وابزانێت کە ئێمە نازەمان گۆڕیوەتەوە لەگەڵ کچێکی ڕەشپێستدا."

ئێمە نەماندەزانی چۆنچۆنی بۆیاخی پێڵاو لابەین، وتمان باشتروایە پرسیار لە هانا بکەین. هاوبەش لای نازە مایەوە و منیش ڕامکرد بۆ لای هانا. کاتێک بۆ هانام گێڕایەوە کە نازە چیی کردووە، هانا وتی:

"بۆ پرسیارم لێدەکەیت ئێوە خۆتان مامۆستای باخچەی منداڵان نین!"

دوایی هانا لـوتی سڕی و پێی وتم ئەو نەخـۆشە و هیچ شتێک نازانێت سەبارەت بە بۆیاخ لابردن.

کاتێک کـە هەستیار گەڕایەوە و نازەی بەوجۆرە بینی، قیژاندی بەسەرماندا:

"ئەرێ ئەوە شێتبوون، ئێوە بۆ ئەو منداڵەتان ڕەشکردووە؟"

ئێمە هەوڵماندا بۆی ڕوونبکەینەوە کە خەتای ئێمە نەبووە. بەڵام هەستیار وا تووڕە بوو کە گوێی لێنەدەگرتین و پێی وتین:

"بەپێی یاسا قەدەغەیە کەسانی وەکو ئێوە نزیکی منداڵی وورد ببنەوە. بڕۆن خۆتان بە منداڵی کەسانیترەوە فێربکەن، نەک بە خوشکەکەی من."

هەرسێکمان یارمەتی یەکترماندا، ئاومان گەرمکرد لە مەنجەڵێکدا و تەشتێکمان بردە دەرەوە بۆ سەر گیاکە و نازەشمان برد بۆ ئەوێ. کاتێک کە نازە دەڕۆی بەو ناوەدا لە دوای خۆی پەڵەی ڕەشی بچکۆلانەی لە سەر ئەرزەکە بەجێدەهێشت. لە ناو تەشتەکەدا پاکپاک شۆردمان لە سەرەوە تا خوارەوە. کاتێک سەرمان شت، تۆزێک کەفی سابون کەوتە ناو چاوی نازەوە. نازە دەستیکرد بە گریان، چ گریانێک لە سەرانسەری دێ بچکۆلدا دەنگی دەدایەوە. شڤان و شاد بە ڕاکردن هاتن وایان دەزانی کاک زۆراب خەریکی سەربڕینی ئاژەڵە. هەستیار پێی وتن:

"هەمووی خەتای ئەم جووتەیە کە دەیانەوێت بەسەر خوشکەکەی منەوە ببن بە مامۆستا."



بە باشی نەمانتوانی ڕەنگە ڕەشەکە لە نازە بکەینەوە. دوای ئەوەی کە شتمان و وشکمانکردەوە، سەرانسەری لەشی نازە ڕەنگێکی خۆڵەمێشی سەیری هەبوو. بەڵام ئەو بە هەرحاڵ دڵخۆشبوو ڕووت و قووت، بە دەوری خۆیدا دەهات و دەچوو و هاواریدەکرد "چۆنی چۆنی" و پێدەکەنی و گژو و گیای هەڵدەگرت و خێرا دەیبرد بۆ دەمی.

منیش وتم "خودایە ئەم منداڵە کە جوانە."

ئێمە لەو بڕوایەدابووین کە ڕەنگە خۆڵەمێشییەکەی نازە ماوەیەکی بوێت بۆئەوەی بڕوات. بە بڕوای شڤان دەبوایە نازە تا ڕۆژی جەژن چاوەڕوانبووایە بۆ ئەوەی ڕەنگە کاڵەکەی خۆی بۆ بگەڕێتەوە. دواییەکەی هەستیار نازەی خستە جێگەوە. نازە دەنگی لێوە نەهات، ئەو پەنجە توتەی دەمژیی و یەکسەر خەوی لێکەوت. هەستیار وتی:

"دەبێت بەو شێوەیە چاودێری منداڵ بکەیت."

دوایی هەستیار چوو بۆ گەوڕەکە بۆ ئەوەی ئالیک بە مەڕەکان بدات. من و هاوبەش لەسەر پێپلیکانەکانی موبەقەکە دانشتبووین. من وتم:

"قوڕ بەسەر دایکی هەستیار، هەموو ڕۆژێک ئەم بەزمەی هەیە لەگەڵ نازەدا."

هاوبەش وتی:

"دەزانیت من ئێستا لەو بڕوایەدام هەرچی باسکراوە لە ڕۆژنامەکاندا زۆری ڕاستنییە. چونکە بە تەواوەتی وەک یەکە، ئەگەر بێت و نەرم و لە سەرخۆ یان بە قیژە و هاوار لەگەڵ منداڵدا ڕەفتار بکەیت. قسەکردن بە زمانی نەرم و شیرین یاخود بە هاوار و قیژەکردن جیاوازی نییە. منداڵ چی بوێت هەر ئەوە دەکات.

ماوەیەکی دوور و درێژ بێدەنگ بووین. منیش بە هاوبەشم وت:

"هاوبەش، ئەریٚ تۆ ئێستا دەتەوێت ببیت بە مامۆستای باخچەی منداڵان."

هاوبەش وەڵامی دامەوە: "لەوانەیە."

وەڵامەکەی هاوبەش گومانی تێدا دەردەکەوت. زۆرینەبرد هاوبەش وتی:

"چی بڵێم سارا گیان، بە خودا زۆر دڵنیا نیم."

# ڕاوە ماسی

چەمی کوڵەبۆز کەوتۆتە ناو دارستانێکی چڕ و دوور لە ئاوەدانیی. لەم چەمەدا نەماندەتوانی مەلە بکەین چونکە ئاوەکەی بە خوڕ دەڕۆیشت.

بەڵام ڕاوە ماسی باشمان تێدادەکرد. شڤان دەڵێت هیچ شوێنێک نییە لە دنیادا وەکو چەمی کوڵەبۆز ماسی زۆری تێدا بێت. هاوبەش جارجار دیقە دیقەی پێدەکردم دەیوت:

"هە ها، ئێمە خاوەنی چەمی خۆمانین، بەڵام ئێوە چەمتان نییە."

"بێگومان ئێمە چەممان هەیە، ئەی چەمی کوڵەبۆز چییە، بەلاتەوە چەمی کوڵەبۆز چەم نییە."

هاوبەش وەڵامی دامەوە:

"هەها، خۆ ئەوە بـە تەنها هی ئێوە نییە. ئـەوە هی هەموومانە. کوڵەبۆز چەند هی تۆیە ئەوەندەش هی منە. کەواتە من ئێستا دوو چەمم هەیە نەک یەکێک."

ئەو ڕۆژە من دڵم لە هاوبەش یەشا. پێموت ئیتر یاریت لەگەڵ ناکەم.

بەڵام ڕۆژی دوایـی ئاشت بووینەوە و ئیتر هیچ گرنگ نەبوو کە هاوبەش خاوەنی چەمی خۆیبوو.

بـه هەرحاڵ ئێمە هەمووومان مەلە لـە چەمەکەی ماڵی هانا و هاوبەش دەکەین و ماسی لە چەمی کوڵەبۆز دەگرین. بێجگە لە دانیشتوانی دێ بچکۆل کەسیتر بۆی نەبوو لەوێ ماسی بگرێت. ئەمەش بـەڕای من یاسایەکی باشـە. هەموو ساڵێک لـە مانگی هەشتدا، دەچین بۆ ڕاوە ماسی.

ئەو ڕۆژە لە لامان بە قەدەر جەژنی قوربان خۆشە. چونکە هەمووومان، بێجگە لە نازە، لەگەڵ باوکەکانمادا دەڕۆین بۆ چەمی کوڵەبۆز.

سەر لە ئێوارە تۆڕەکان دەنێینەوە. کەپر و کوخ دروستدەکەین و شـەو لەوێ دەنووین. ڕۆژی دوایـی سەر لە بەیانییەکـەی زوو هەڵدەستین تۆڕەکان لە چەمەکە دەردەهێنینەوە و ئەوسا بۆمان دەردەکەوێت چەند ماسیمان ڕاوکردوە.

لـە هەموو شتێک خۆشتر، ئەو کاتەیە کـە شەو دادێت و لە دارستانەکەدا دەخەوین. چونکە چەمـی کوڵەبۆز زۆر دوورە لـە ئاوابیەکەمانەوە و ڕێگاکـەش زۆر ناخۆشە، ناکرێت هەمان ڕۆژ بگەڕێینەوە بۆ ماڵەوە و بەیانی زوو بێینەوە بۆ چەمەکە.

باوکم دەڵێت ئێمە بەختێکی باشمان هەبووە کە کوڵەبۆز کەوتبووە ناو دارستانەوە.

ئەگینا دایکم بە دڵنیایی نەیدەهێشت کە ئێمە لە دارستان شەو بمێنینەوە.

دایکم هەمووساڵێک ئەمەی دوبارە دەکردەوە:
"من دەترسم، مارێک بدات بە منداڵەکانمەوە."
بەلای کەمەوە دەبێت پێنج کیلۆمەتر بەپێ بڕۆین بە ڕێگایەکی باریکی ناو دارستانەکەدا. ئەم ڕێگایە پێچاوپێچ بوو تا دەگەیشتینە چەمی کوڵەبۆز. ئێمەش شتی زۆرمان بە کۆڵەوەبوو، بەتانی و کۆڵەپشت کە هەموو جۆرە شتێکی تێدا بوو.
باوکمان پێشتر پێی وتبووین:
"کڕوزانەوە نییە، ئەوەی بکڕوزێتەوە بۆی نییە لەگەڵماندا بێت و شەو لە دارستان بمێنێتەوە."
هەر کە گەیشتینە چەمی کوڵەبۆز، سەیرمانکرد، شوێنەواری کەپرە کۆنەکانی ساڵی پێشوومان دیاربوو. من و هانا و هاوبەش شۆڕەبییەکمان هەڵبژارد.
دارەکە باشترین شوێن بوو بۆ کوخ دروستکردن. لقەکانی شۆڕەبییەکە شۆڕببوونەوە بۆ خوارەوە. ئێمە بڕیارماندا، بن دارەکە بکەین بە کوخێک. باوکی من و باوکی هانا و هاوبەش لقە دار و پووش و پەلاشیان لەملاولەولا کۆکردەوە. ئێمەش ووردەووردە دەوری لقە شۆڕبووەکانی شۆڕەبییەکەمان گرت. زۆری نەبرد کوخێکی خنجیلانەمان دروستکرد. تەنها یەک کونمان هێشتەوە بۆ ئەوەی بە سکەخشکێ لەوێوە بڕۆین و بێین.

دوایی پووشێکـی زۆرمان هێنا و ڕامانخست لەناو کوخەکەدا بۆ ئەوەی شەو لە سەری بنوین.

هەر کە لە کوخ دروستکردن بووینەوە، چووین بۆ سەیری کەپری کوڕەکـان. هەمیشە ئـەوان کەپرەکەیان لـە شوێنی سـەیردا درووستدەکرد. بە پووش و لقە دار سەری کەپرەکەیان دەگرت و لە سەریشی دەنووستن. شڤان وتی:

"چەند خۆشە ئێمە کچەکانمان لەگەڵدا نییە و بۆ خۆمان لە کەپری خۆماندایین."

شاد و هەستیار پێکەوە وتیان:

"ڕاستدەکەیت، ئای... کە خۆشە کە ئەوانمان لەگەڵدا نییە."

هانا وەڵامی دانەوە:

"هەرچۆنێک بێت کوخەکەمان جوانتر و خۆشترە لە کەپرە بچکۆلانە ناشیرینەکەتان." شڤان و شاد و هەستیار دایانە قاقای پێکەنین و وتیان: "ئەوان بەزەییان بە ئێمەدا دێتەوە چونکە ئێمە زانیاریمان لە چۆنیەتی کوخ درووستکردندا نییە."

پێش ئەوەی کە ئێمە وەڵامیان بدەینەوە باوکی هەستیار بانگی کردین کە یارمەتیان بدەین لە دوورینەوەی تۆڕی ماسییەکاندا.

لـە پێش هەموو شتێکدا، دەبـوایە کونە گەورەکانی تۆڕەکانمان بدوریایەتەوە، بۆ ئەوەی ماسییەکان لەو کونانەوە دەرباز نەبن.

ئێمە لە خوار چەمەکەوە لە سەر بەرزاییەکە دانیشتبووین خەریکی دوورینەوەی کون و کەلەبەری تۆڕەکان بووین و قسەمان لەگەڵ یەکتری دەکرد و پێدەکەنین.

خۆر زۆری نەمابوو ئاوابێت. دەوروبەری چەمەکە زۆر بێدەنگ بوو، بێگومان ئەو کاتانەی کـە ئێمە خەریکی دەنگەدەنگ نەبوویـن. باوکم وتی:

"ئەم چەمە چەمێکی زۆر دڵگیرە."

بەلەمەکانمان کە بەسترابوونەوە بە قەراخی چەمەکەوە پڕ بوون لە ئاوی باران. باوکی هەستیار بە جامێک خەریکی ئەوە بوو ئاوەکە فڕێبداتە دەرەوە. دوایی باوکەکان تۆڕەکانیان خستە ناو بەلەمەکانەوە. هەموومان سواری بەلەمەکان بووین بە سەوڵلێدان ڕۆیشتین. بەناو چەمەکەدا. ئێمە شوێنی تایبەتی خۆمانمان هەبوو. کە ساڵانە تۆڕی ماسییەکانمان تێدا دەنایەوە. کاتێک کە تەواو بووین دنیا خەریکبوو تاریکدەبوو. هاوبەش نوقورچێکی لە دەستمگرت و پێی وتم:

"ئەوەندەی جەژنی قوربان خۆشە."

کاتێک کە تاریکبوو. هەروەکو هەموو ساڵەکانی پێشوو، باوکەکان ئاگریان لەسەر بەرزاییەکە کردەوە.

ئێمەش لە دەوری ئاگرەکە کۆبووینەوە. تەرمۆزەکەمان دەرهێنا و چای گەرممان خواردەوە و نانە چەورەمان پێوە خوارد.

شەوقی ئاگرەکە زۆر جوانبوو، کاتێک پەخش دەبووەوە بەسەر ئاوەکەدا. وا دەردەکەوت کە چەمەکە ئاگری تێبەڕ بووبێت. لەپڕ تاریکییەکی چڕوپڕ و بێدەنگییەکی سامناک دەورەی داین. شڤان وتی:

"من گوێم لێیە کـە جنۆکەکان لەسەرخۆ دەڕۆن و دێن بـە ناو دارستانەکەدا."

من و هاوبەش ترسمان لێنیشت هەرچەندە هاوبەش وتی:

"ڕاست ناکەیت. تۆ ڕاستت نییە. جنۆکە کوا لەم دارستانەدایە."

بەڵام بە هەرحاڵ من و هاوبەش گوێمان ڕاگرت، بەڵام گوێمان لە جنۆکە نەبوو، لە سەرخۆ بە تاریکیدا بڕۆن. شڤانیش پێی وتین:

"جنۆکە دەنگی ڕۆیشتنیان نایەت لەبەرئەوەی کە ئەوان قاچیان توکی زۆری پێوەیە. ئەوان بێدەنگ و لەسەرخۆ دێن و دەڕۆن. ئێستا وەستاون لە پشتی دارەکانەوە و سەیرماندەکەن."

لەترسا تۆزێک خۆم نزیککردەوە لە هاوبەشەوە و بە شڤانم وت:

"نا، شتی وانییە."

"بەڵێ وایە، هەموو دارستانەکە پڕە لە چاوی جنۆکە، ئەوان هەر ئێـستا سەیرمان دەکەن، بەڵام ئـەوان ناوێرن نزیکمان ببنەوە، چونکە ئەوان لە ئاگرەکەمان دەترسن."

ئەو کاتە باوکم شڤانی ئاگادار کردەوە:

"بەسـە ئیتر، واز بێنە. شـتی پڕوپووچ مەخەرە مێشکـی کچە بچکۆلەکانەوە."
دوایی باوکم چەند بڕێک داری ئەستووری وشکی لە سەر ئاگرەکە دانا. دارەکان ئاگریان گرت و بە دەوری خۆیاندا شەوقێکی جوانیان دایەوە.
من لەو بڕوایەدا نەبووم کە جنۆکە هەبێت. بەڵام هەر بۆ دڵنیایی لە کۆشی باوکم دانیشتم. هاوبەشیش لە کۆشی باوکی دانیشت. باوکی هانا و هاوبەش کەوتە فیکە لێدان، ئەو ئێجگار فیکەی جوان لێدەدات، کە هەر لە دەنگی بولبول دەچوو.
من بیرم لەوە دەکردەوە ئەگەر لە ڕاستیدا جنۆکە هەبێت. ئەوان لەوانەیە بە لایانەوە سەیربێت،
بۆچی ئێمە لە دەوری ئەو ئاگرە دانیشتووین؟
بۆچی باوکی هانا و هاوبەش لە نیوەی شەودا خەریکی فیکە لێدانە؟
باوکەکان بەسەرهاتیان دەگێڕایەوە و ئێمەش زۆر پێکەنین چونکە بەسەرهاتەکانیان زۆر خۆشبوو.
شڤان و شاد و هەستیار گڵۆپە دەستییەکەیان برد و چوون بگەڕێن بە دوای جنۆکەدا.
کاتێک کە ئاگرەکە تینی نەما، خەریکبوو لە خۆیەوە دەکوژایەوە.
باوکـی هانا و هاوبەش وتی ئیتر کاتی خەو هاتـووە. باوکەکان

کەپریان نەبوو. هەر لە دەوروبەری ئاگرەکە، بەتانییەکانیان لولکرد بە لەشیانەوە و لێی نووستن. من و هانا و هاوبەش بەسکەخشکێ چووینە ناو کوخەکەمانەوە و بەتانییەکانمان توند بە لەشمانەوە پێچا و نیازمان بوو بنوین.

بەڵام لەپڕ گوێمان لەخشەخش بوو بۆیە منیش هاوارمکرد:

"ئەوە کییە؟"

شڤان وەڵامیدامەوە:

"جنۆکەیە."

ئێمە لە کونی کوخەکەوە سەیرمانکرد، کوڕەکان لە دەرەوە وەستابوون و گلۆپە دەستییەکەیان داگیرساند بوو. ئەوان دەیانویست کوخەکەی ئێمە ببینن. یەک یەک بە سکەخشکێ هاتنە ژورەوە. هەموو جێگەمان لە کوخەکەدا بووەوە، بەڵام جێگەکە تۆزێک تەنگ بوو.

کوڕەکان وتیان کە کوخەکەمان جوانە.

دوایی بە سکەخشکێ چوونە دەرەوە. پێش ئەوەی کوڕەکان دوور بکەونەوە شڤان وتی:

"کوخێکی ڕێک و پێکە بەڵام دادی جنۆکە نادات."

کوڕەکان ڕۆیشتن بۆ کەپرەکەی خۆیان و ئێمەش ویستمان بنوین.

لە سەرەتادا هەستم بەشتێکی سەیر دەکرد، ئێمە لە دارستاندا پاڵ کەوتوین. لەپڕ هەستێکم لەلا دروستبوو کە لەوانەیە جنۆکەکان لە تاریکی شەودا وەستابن و گوێیان لێگرتبم.

وابزانم هانا و هاوبەش پێش من نوستن. منیش ماوەیەکی زۆر بەخەبەر بووم گوێم لە خشەخشێک بوو لەناو دارستانەکەدا.

هەروەها لە دەنگی شەپۆلە وردە هێمنەکان کە لە سەرخۆ خۆیان دەدا بە کەناری چەمەکەدا. بەلامەوە سەیر بوو. ئەوەی ڕاستیش بێت ئـەو کاتەی من لە سەر پووشەکـە پاڵکەوتبووم، نەمدەزانی دڵتەنگم یاخود دڵشادم.

کاتژمێر چواری بەیانی بـوو، خۆر تازە هەڵهاتبوو. باوکـم هات خەبەری کـردینەوە. من زۆر دڵخۆشبووم هەرچەندە لە سەرمایا هەڵدەلەرزیم.

ئێمە بە سکەخشکێ لە کوخەکەوە هاتینە دەرەوە، باوکم خەریکی ئاگر کردنەوە بوو. چەمی کوڵەبۆز تۆزێک تەمی لە سەر بوو.

من و شڤان و شاد و باوکم سواری یەکێک لە بەلەمەکان بووین، ئەوانیتریشمان لە بەلەمەکەی تردابوون. کەوتینە سەوڵ لێدان بۆ هێنانەوەی تۆڕی ماسییەکان. من زۆر بەزەیم بەوانەدا دەهاتەوە کە هەرگیز سواری بەلەم نەبوون و سەوڵیان لێنەداوە، یان لە چەمێکدا کاتژمێر چواری بەیانی ڕاوە ماسییان نەکردووە.



تـۆڕەکانمان ماسـی زۆری پێوە بـوو. شڤان و شاد ماسییە گەورەکانیان کۆدەکردەوە بەڵام من و هاوبەش نەماندەوێرا توخنی ماسییە گەورەکان بکەوین. چونکە دەترساین گازمان لێبگرن. شاد ماسییەکی لە تۆڕەکە دەرهێنا و ماوەیەک لێی وردبووەوە، لەپڕ ماسییەکەی بەرەڵاکردە ناو چەمەکەوە.

شڤان قیژانی بەسەر شاددا:

"ئەرێ بۆچی ئەو ماسییەت بەرەڵاکرد؟ خۆ شێت نەبوویت، چۆن ماسی گیراو بەرەڵا دەکەیتە ناو چەمەکەوە!"

شادیش وتی:

"ڕاستدەکەیت! بەڵام بەزەیم بە چاویدا دەهاتەوە زۆر غەمبار دیار بوو."



شڤان وتی:

"گێل مەبە، ئێستا ماسییەکە بەسەرهاتی خۆی دەگێڕێتەوە بۆ هەموو ماسییەکانیتر. ئیتر ساڵێکیتر هیچ ماسیترمان بۆ ڕاو ناکرێت، نازانم تۆ بۆچی بەرەڵاتکرد، بۆ؟"

شاد جارێکی تر وتی:

"بەزەیم پێداهاتەوە. لە چاوەکانیدا دیاربوو کە زۆر خەمبارە."

لە هەمانکاتدا، هەستیار و هانا و هاوبەش و ئەوانیترمان لە بەلەمەکەی تردا بینی، ئێمە قیژاندمان:

"ئەرێ هیچ ماسیتان گرتووە؟"

هەستیار وەڵامی داینەوە:

"ئەوەندە ماسیمان گرتووە، خەریکە بەلەمەکەمان نوقم دەبێت."

دوایی گەڕاینەوە بۆ بارگەکەمان، ماسییەکانمان خستە ناو زەمیلەی گەورەی قوماش کە سەرقاپی بۆ دروستکرابوو.

کاتێک بە ڕێگاوە بووین بۆ دێ بچکۆل. هێشتا شەونم بە سەوزە گیاکانەوە مابوو. تیشکی خۆر لە ملاولەولا، لە نێوان لقەکاندا وەکو گەوهەر دەدرەوشایەوە.

من خەوم دەهات و برسیشم بوو، پێڵاوەکانم تەڕببوو. بەڵام زۆر دڵشاد بووم. چونکە بەلامەوە زۆر خۆشبوو. بەو ڕێگا پێچاوپێچەدا بەدوای یەکتریدا دەڕۆیشتین و دنیایەک ماسیمان ڕاوکردبوو. باوکی هانا و هاوبەش فیکەی لێدەدا و ئێمەش گۆرانیمان دەوت:

"ڕاوچییەک چوو بۆ ڕاو."

لە پڕ شڤان قیژاندی:

"لێرەوە دوکەڵی ئاواییەکەمان دەبینم."

هەمووومان سەیری دوکەڵەکەمانکرد کە لەسێ شوێنەوە دەهاتە دەرەوە. ئیتر بە دوکەڵەکەدا زانیمان ماڵەوەمان بەخەبەرن. زۆری نەبرد گەیشتینە دێ بچکۆل.

خۆر پەخش بووەوە بەسەر خانووەکانەوە، بە پەنجەرەکانەوە. دیمەنێکی زۆر جوان بوو.

من بە هاوبەشم وت:
"من بەزەیم بەو کەسانەدا دێتەوە کە شوێنێکیان نییە تێیدا بژین."
هاوبەشیش وتی:
"منیش بەزەییم بەو کەسانەدا دێتەوە کە لەدێ بچکۆل ناژین."
باپیرە هەر لە زووەوە بەخەبەربوو، لە نزیکی داری شۆڕەبییەکەوە دانیشتبوو لە سەر کورسییە جۆلانەکەی. کە باپیرە گوێی لە دەنگە دەنگمان بوو هاواری لێکردین.
"ئەرێ هیچ ماسیتان گرتووە؟"
باوکی هانا و هاوبەش بە گاڵتەوە وەڵامی باپیرەیان دایەوە:
"ئەوەندە ماسیمان گرتووە کە هەرگیز باپیرە لەژیانیدا نەیگرتووە."
باپیرەیش وتی:
"هۆهۆیایا، کوڕە من کاتی خۆی لە چەمی کوڵەبۆز ئەوەندە ماسیم گرتووە کە لەژماردن نایەن."
من و شڤان و شاد تۆزێک لای باپیرە دانیشتین و دوایی چووینەوە بۆماڵەوە.